# کۆمەڵگای کوردی و پەرەسەندنی ئاسروشتی

عەتا قەرەداخی

2001

ناوی کتێب: کۆمەڵگای کوردی و پەرەسەندنی ناسروشتی

بابەت: لێکۆڵینەوە

نووسینی: عەتا قەرەداخی

تیراژ: ٥-

ساڵ: ٢-١

چاپی: یەکەم

چاپخانە: دانلز

زمارەی سپاردن: ٥٦١ ی وەزارەتی رۆشنبیری ساڵی ٢-١ی دراوەتێ

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و رووناکبیریی گەلاوێژە

سلێمانی — گردی عەلی ناجی ☎ (٢٢٥٠٧)

## ناوەرۆك

١-پێشەكی
٢-رۆڵـی تۆپۆگرافیـا لـە شـێواندنی گەشـەی سروشـتی كۆمەڵایـەتی كۆمەڵگای كوردیدا.
٣-خێڵایـەتی كـوردی و ئاسـتەنگەكانی بـەردەم دروسـتبوونی فیدراسیۆن.
٤-دروستنەبوونی ناوەندی ئابوری لە كوردستاندا.

# پێشەکی

خوێنەری خۆشەویست ئەمەی لە دووتوێ ئەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە هەوڵێکە بۆ ئاخاوتن لەسەر بنیادی پێکهێنەرانەی کۆمەڵگای کوردی و لە هەمان کاتیشدا قسەکردن لە بارەی ئەو هۆکارە ناوخۆییانەوە کە ڕۆڵی لەبەرچاویان هەبووە لە شێواندنی سروشتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیدا، کە یەکێك لە سەرەکی ترینی ئە هۆکارانەش بریتی‌یە لە نالەباری تۆپۆگرافیای کوردستان. تۆپۆگرافیای نالەبارو ئاڵۆزی کوردستان هەر لە دێرزەمانەوە کاری لە شێوازی نیشتەجێ بوون کردووەو ئەوەش لە ئاستێکی تردا ڕۆڵی نێگەتیڤی هەبووە لەسەر پەرت و بڵاوکردنەوەی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هەریەکە پانتاییەکی جوگرافی دیاری‌کراو بکاتە جوگرافیای خۆیی و چ نیشتەجێ بووبێت چ کۆچەری لە سنووری ئەو قەڵەم ڕەوەدا ژیان بگوزەرێنێ. ئەمەش بۆتە هۆی داخرانی خێڵ و عەشیرەتی کوردی بە رووی خۆیداو دابڕاو و بێ پەیوەندی لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتەکانی تردا، کە ئەنجام ئەم حاڵەتی داخرانە عەقڵی تاکڕەویی و ستراتیژی تەنیا هەر خۆمی لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کوردی‌دا دروستکردووە کە ئەو عەقڵیەتەش تاکو ئێستا کاردەکات و یەکێکە لە هۆیە سەرەکیەکانی مانەوەی کۆمەڵگای کوردی لە حاڵی دواکەوتوویی و پەرەوازەیی و نەگەیشتوو بە ئاستی دروستکردنی دامەزراوە کۆمەڵایەتیە باڵاکاندا کە لە سەرووی هەموویانەوە دەوڵەتە.

ئەگەر بهاتبا کورد تەنیا کەموکورتیەك کە هەیبێت ئەو تۆپۆگرافیا نالەبارە بوایە ئەوا دەشیا هێزی پایە ناوخۆییەکانی تری پەرەسەندنی بەجۆرێك کاریان بکردایە کە کەموکوڕی فاکتەری تۆپۆگرافی ئەو رۆڵە کاریگەرەی نەبینیایە، بەڵام بە پێچەوانەوە لاوازی فاکتەرەکانی تر یان لاوازی پایەکانی تری بوون بە هۆکارێك بۆ ئەوەی رۆڵی تۆپۆگرافیای نالەبار بە ئاشکرا دیاربێت و سروشتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیش تووشی لادان بکات بەجۆرێکی ئەوتۆ کە کۆمەڵگای کوردی بکاتە کۆمەڵگایەکی تایبەتی ئەوتۆ کە نەشێت بەپێی پێوەرە گشتی و جیهانیەکان بۆ لێکدانەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایە لێك بدرێتەوە، بەڵکو پێویستی بەوە بێت کە بەپێی شیکردنەوەی تایبەتمەندانەی خودی بنیادی ئامادەی خۆی لێك بدرێتەوە. هەر لێرەوە دەتوانین بڵێین کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکە لە رووی گەشەی کۆمەڵایەتیەوە نە هاوشێوەی کۆمەڵگا گەشە ئاساییەکانە لە نموونەی کۆمەڵگای رۆژئاوایی، نە هاوشێوەی تەواوەتی کۆمەڵگا رۆژهەڵاتیەکانە لە رووی بنیادو پەرەسەندنەوە بۆیە بە پێوەری هیچ کام لەو کۆمەڵگایانە ناپێورێت.

دیارە ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە سەرباری نالەباری تۆپۆگرافیای کوردستان و دەوری لە شێواندنی پەرەسەندنی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیدا، دیسان نە خێڵایەتی کوردی گەیشتۆتە ئاستی پێکهێنانی فیدراسیۆنی خێڵایەتی و لەوێشەوە بنەمای دروستکردنی دەوڵەتی خێڵایەتی کوردی فەراهەم ببوایە. نە ئابوری بەجۆرێکی ئەوتۆ لە کوردستاندا کۆبۆتەوە کە ناوەندی ئابوری دروست ببوایەو ئابوری رۆڵی لە بزواندنی مێژوودا ببینیایە. لێرەدا هەوڵمان داوە ئەو سێ تەوەرە بکەینە بنەمای لێکۆڵینەوە لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی و لەوێشەوە هەم ئاخاوتن لەسەر ناسروشتی شێوازی گەشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی بکەین، هەم

لەوە بدوێین کە چۆن ئەم هۆکارانە دەوریان بینیووە لە تێکەڵ بوونی قۆناغە مێژوییەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردیدا و چۆن لە ئەنجامی ئەوەشدا سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵ بەنێو یەکداچوون و هیچ چین و توێژێکی کۆمەڵایەتیش نەبۆتە خاوەنی خاسێت و سیمای چینایەتی و کۆمەڵایەتی خۆیو بەهەمان شێوەش نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی خۆی ببینێت.

دیارە هەر کەموکورتیەك لە سروشتی پێکهاتنی چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگای کوردیدا پەیوەندی بەو شێواندنەوە هەیە کە لە شێوازی گەشەی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایەدا ڕوویداوە کە بێگومان سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی کوردیش پەیوەندی بەو شێوازەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایەوە هەیە، دیسان دەبێ ئامارەش بۆ ئەوە بکەین کە یەکگرتنەوەی ئەم کۆمەڵگایەو یەکبوونی ئەو کاتە دەگاتە ئەنجام کە هەستی نەتەوایەتی بەجۆرێك گەشە بکات و پەرە بسەنێت کە دیواری نێوان خێڵ و عەشیرەت و عەقڵ و ستراتیژی خێلایەتی هەڵوەشێنێتەوەو عەقڵ و ستراتیژی نەتەوایەتی جێگایان بگرێتەوە، بۆ ئەم سەردەمەش تەنیا لەکاتی بالادەستبوونی هەست و هوشیاری نەتەوەیی و هەر بەو پێیەش دروستبوونی عەقڵ و ستراتیژی نەتەوەیی کوردیدا دەشێ پرۆژەی سەربەخۆیی کوردستان و دروستبوونی دەوڵەتی کوردی بگاتە ئەنجام، کە دیارە ئەوەش ئامانجی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردە چ بانگەشەی بۆ کرابێت یان تاکو ئێستا لەبەر زۆر هۆکار پەردەی لەسەر نرابێت.

٢٠٠٠/١٠/١٨

# سەرەتا

قسەکردن لەسەر جوگرافیا بەو مەبەستە نیە کە جوگرافیا بریتی بێت لەو رووبەرانەی لەسەر نەخشەی جوگرافی دیاریکراوەو بەپێی ژمارەی هێڵەکانی پانی و درێژی یان بەپێی سنووری سیاسی و پێگەی جیۆپۆلەتیکانە دەست نیشان بکرێت. بەڵکو ئەم لێکۆڵینەوە مەبەستی یەتی کاریگەری سروشتی جوگرافی و پێکهاتەی جوگرافی کوردستان و رۆڵی تۆپۆگرافیای کوردستان لەسەر گەشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری دیاری بکات و جێکەوتی ئەو کارگەرییانە لە شێواندنی پێکهاتن و پەرەسەندنی کۆمەڵگای کوردیدا بخاتەڕوو. بە واتایەکی دی رۆڵی ئەو کاریگەرییانە لە شێواندنی پێکهاتن و پەرەسەندنی کۆمەڵگای کوردیدا دیاری کات. بە واتایەکی تر ئەم لێکۆڵینەوەیە مەبەستی یەتی پەیوەندی نێوان سروشتی جوگرافیای کوردستان و مێژووی گەشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی بدۆزێتەوە. لە درێژەی باسەکەشدا میتۆدێکی تایبەتی لێکۆڵینەوەی سیۆسیۆلۆژی لەبەر نەگیراوە. بەڵکو هەوڵدراوە لە پێناوی ئامانجی سەرەکی باسەکەدا میتۆدو رێبازە جیاوازەکانی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی کۆمەڵناسی بەکاربهێنرێت. بێگومان جێگای خۆیەتی هەر لەم سەرەتاوە ئاماژەش بۆ ئەوە بکەین کە دەبێ توێژینەوەی هەر لایەنێکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی راستەوخۆ لەنێو خودی پێکهاتەی ئەم کۆمەڵگایەوە دەست پێ

بکات و پشت بە شیکردنەوەی بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵگای کوردی خۆی ببەستێت.

جوگرافیا لە دوو رووەوە دەکرێت بە بنەما بۆ قسە لەسەرکردن، یەکەمیان جوگرافیا وەکو بنەمای زەمینەی دروستکردنی مێژوو. دووەمیان جوگرافیا وەکو سروشت، ئەو سروشتەی کە لە کۆتایی عەقڵانیەتی کلاسیکەوە بوو بە مەنزڵگای لەباوەش گرتنەوەی مرۆڤی راکردو نێو پرۆسیسی ئاڵۆزو میکانیزمە جوڵەی سەرجەم توخم و رەگەزە پێکهێنەرەکانی شارستانی رۆژئاوا لە شێوازێکی ئۆرگانیدا کە هەستی رۆمانسی و لەلایەکی تریشەوە غەریزەی سەرەتایی بوون چۆن لەو قۆناغەدا مرۆڤی پاڵ دەنا هەتا لەو ژینگە ئاڵۆزەوە بگەڕێتەوە بۆ نێو سروشت و بۆ ئامێزی ژیانی سادەو سەرەتایی نێو سروشت. ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوە خۆی پێوە خەریك دەکات بریتییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ جوگرافیادا وەکو زەمینەو بنەمای دروستکردنی مێژوو.

هەڵبەت جێگای خۆیەتی ئاماژەش بۆ یەوە بکەین کە قسەکردن لەسەر مێژوو و پەرەسەندنی کۆمەلایەتی بەپێی مێژوو مەبەست نە لێکۆڵینەوەیەکی مارکسیانەی یەك لایەنەیە. نە روانینیشە بۆ مێژوو و شارستانیەت لە تێڕوانینی مارکس یان هیگڵەوە بەتەنیا روانینیش لە روانگەی هیچ فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیاو ئایینێکەوە بەشێوەیەکی سەربەخۆو دابڕاو لە فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیاو ئایینەکانی تر. مەبەستمان ئەوە نیە کە وەها سەیری مێژوو بکەین کە هێڵێکی درێژکراوەیە لە کۆمۆنەی سەرەتاییەوە بۆ کۆمۆنەی بالا، یان پەراندنەوەی کۆمەڵگا بۆ گەیشتن بە رۆحی رەهاو گۆڕینی و بڵندبوونی بۆ ئاستێکی پێناسە نەکراوی تر لە رووی هۆشیارییەوە، هەروەك لێرەدا نامانەوێت بە چاوێکی لایەنگرانە سەیری هیچ بۆچوون و تیۆرێك بۆ پەرەسەندنی کۆمەلایەتی و سروشتی دەسەلات و گەیشتنی کۆمەڵگا بە ئاستی پێکهێنانی دەوڵەت بکەین، بەڵکو لایەنگری یەك بۆچوون دەکەین کە

ئەویش ئەوەیە بزوێنەری مێژووی هەر کۆمەڵگایەك لەناو بنیادو پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگایەوە دروست دەبێت و سەرهەڵدەدات و دەشێ نە لە بزوێنەری مێژووی کۆمەڵگاکانی تر بچێت، نە وەکو ئەوانیش کار بکات. بەڵام ئەوەی کە جەختی لەسەر دەکەین ئەوەیە کە کاریگەری دەرەکی جگە لە ڕێگا خۆشکردن و بارو دۆخ ئامادەکردن و زەمینە ڕەخساندن ناتوانێ دەورێکی زیاتری لە دروستکردنی مێژووی شارستانیدا هەبێت.

دەشێ تێڕوانینی ئێمە لە بارەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایە جیاواز بێت لەوەی لە ڕابردووەوە تاکو ئێستا کاری پێکراوە کە ئەویش لە هاوشێوەکردنی سەرجەم دیاردە کۆمەڵایەتیەکاندا لەگەڵ کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانی تردا خۆی دەبینێتەوە. بە مانایەکی تر ئێمە دەمانەوێت پێ لە سەر ئەوە دابگرین کە کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی تایبەتە و جیاوازە لە کۆمەڵگا ئاساییەکان بۆیە دەبێ بە میتۆدو ڕێبازی تایبەتیش ئاخاوتنی لەسەر بکرێت و دەبێ هەر ئاخاوتنێکیش لە بارەیەوە لەسەر بنەمای شیکردنەوەی بنیادی کۆمەڵایەتی خودی ئەم کۆمەڵگایە بێت نەك لەسەر بنەمای تیۆرە ئامادەکان و لەسەر بنەمای هاوشێوەکردن لەگەڵ کۆمەڵگای گەشە ئاساییەکاندا قسە لەسەر کۆمەڵگای کوردی بکرێت و بەوەش دەرگای کارکردن و شیکردنەوەی بنیادی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایە دابخرێت.

ئەگەر سەرنجی چەمکی ئەرستۆیی بدەین بۆ گەشەی کۆمەڵایەتی و شارستانیەت و تەنانەت بۆ هەر کردارو پرۆسێسێکی کۆمەڵایەتی و غەیری کۆمەڵایەتیش، تەنانەت بۆ دیاردە گەردونیەکانیش ئەوا هەموو یەکێك لەم دیاردە جۆراوجۆرانە ئاراستە جوڵەیەکی هەیە کە لە سەرەتاوە دەست پێدەکات و بۆ هەڵکشکان و بۆ لوتکەو پاشان قۆناغی وەرچەرخان بەرەو داڕمان و هەرەس هێنان و کۆتایی دەست پێدەکات. لێرەوە دەشێ ئەو پرسیارە سەرهەڵبدات ئایا کۆمەڵگای کوردی کە

ئێستا لە پەراوێزو لە دەرەوەی مێژوودایە هیچ سوڕێکی پەرەسەندنی ئەوتۆی بینووە کە گەیشتبێتە لوتکەو شارستانێتی بەرهەم هێنابێت و پاشان قۆناغی پیربوون دەستی پێکردبێت و لەوێشەوە جوڵەی بەرەو هەرەس و کۆتایی دەستی پێکردبێت؟ بێگومان هیچ بەڵگەیەکی تۆمارکراو لەو بارەیەوە لە ئارادا نیە، لەلایەکی تریشەوە سەرجەم ئەم کۆمەڵگایانەی کە گەیشتوونەتە لوتکەی پەرەسەندنیان لە قۆناغێکداو دواتر هەرەسیان هێناوە ئەوە جۆرێک نە پاشماوەی ئیداری و شارستانێتیان لە پاش بەجێماوە کە تاکو ئێستاش زیندوویی ئەوان دەسەلمێنێت، باشترین نموونەش گریک و رۆمان و گەلانی دێرینی میزۆپۆتامیاو میسریە کۆنەکان و.. تاد.

کۆمەڵگای کوردی لە رابردوودا نەگەیشتۆتە ئەو ئاساتەی گەشەکردن، ئێستاش هەر لە پەراوێزدایە. بێگومان کۆمەڵە هۆکارێك لەو بوارەدا دەوریان بینیوە کە هەموویان پێکەوە بوونەتە هۆی شێواندنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایەو مانەوەی لە پەراوێزدا. ئێمە لێرەدا دەربارەی یەکێك لەو هۆکارانە دەدوێین کە ئەویش رۆڵی تۆپۆگرافیای نالەباری کوردستانە لە بواری شێواندنی شێوازی سروشتی دابەشبوونی دانیشتوان و چۆنێتی نیشتەجێبوون و دروستبوونی شارەکانی کوردستان و ئاست و سروشتی بەرهەم هێنان و کارکردنی هەموو ئەمانەش پێکەوە بۆ شێواندنی شێوازی سروشتی گەشەکردن و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی. دیارە بۆ قسەکردن لەسەر ئەو بابەتەش دەبێ بگەڕێینەوە بۆ توێژینەوەی پێکهاتەی جوگرافیاو تۆپۆگرافیای کوردستان.

## سروشتی جوگرافیای کوردستان

جوگرافیای کوردستان خاوەنی خەسڵەت و سیفاتی خۆیەتی دەشێ زۆر جوگرافیای تریش هەبن کە هاوشێوەو هاوخاسیێتی جوگرافیای کوردستان بن و کۆمەڵگاکانیشیان بە سروشتی قۆناغەکانی پەرەسەندنی کۆمەلایەتیان بڕیبێت، بەلام دیارە زۆر هۆکاری تر لە جوگرافیاو تۆپۆگرافیاو شوێنی جوگرافی کوردستاندا ڕێگایان بۆ ئەوە خۆشکردووە کە جوگرافیا نەتوانێت دەورێکی ئەوتۆی هەبێت لە دروستکردنی شارستانێتیدا کە بە گوێرەی ئەو جوگرافیایانەی تر کە هاوشێوەی کوردستانن ئەو هۆکارە یارمەتی دەرانە بۆ شێواندنی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی بوونیان نیە.

جوگرافیای کوردستان وەکو زەمینەی نیشتەجێ بوونی کورد کە دەشێ بە نیشتمانی کوردیش ناوبرێت لە رووی تۆپۆگرافیاوە ناوچەیەکی ئاڵۆزەو بواری ژیان تیایدا ئاسان نیە، تەنانەت لە مێژووی نوێشدا داهێنانەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا لەم جوگرافیایەدا نەیتوانیووە دەوری کۆنترۆڵکردنی سروشت ببینێت و بگرە تاکو ئێستاش دەشێ وەها سەیری کوردستان بکرێت کە جوگرافیایەکی ئاشکرا نەکراوە، لە رووی تۆپۆگرافیاوە ئەم جوگرافیایە پێکهاتووە لە چیای سەخت و گردو بان و دۆڵ و ناوبەناو دەشتی تەسکیشی تێدایە.
زۆربەی زۆری چیاکان بە دارستان داپۆشراون جگە لە چەند جێگایەکی سەخت کە بەهۆی بەردو تاوێرو لێژییەوە درەختیان لێنەڕواوە.

ئاووهەوای کوردستان کە بریتی‌یە لە بەشێك لە پێکهێنەری ئەتمۆسفیری ئەم وڵاتە ئاووهەوایەکی نالەبارە، زستانی ساردو سەخت و بەهارو پایزی کورت تەمەن لەگەڵ هاوینی دوورو درێژەو وشك. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە ساڵ لە کوردستاندا لە دوو وەرزی سەرەکی پێکهاتووە. زستان و هاوین.

ئەم بارەی ئاووهەوا لەسەر باری پێکهاتەی خاکەکەی نەك هەر کاری لەباری سایکۆلۆژی و میزاجی مرۆڤی کورد خردووە بەڵکو رۆڵێکی دیاری لەگەشەی عەقڵی و هۆشی مرۆڤی کورددا بینیووەو لە ئاستێکی قوڵدا کاری لە چۆنێتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیش کردووە. چونکە ئاووهەوا دەورێکی کاریگەری هەیە لە سروشتی پێکهاتنی باری عەقڵی و زیهنی و مەعنەوی کۆمەڵگادا، هەروەك خودی ئاووهەواش فاکتەری سەرەکیە لە پێکهێنانی ژێرخانی ئابووری و رێکخستنی شێوازی پەرەسەندنی کۆمەڵگادا. هەروەك لە روانگەی تیۆری کۆمەڵایەتی مارکسیەوە ئابوری بزوێنەری مێژووە. دیارە ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە راستی ئەو قسەیە بسەلمێنین بەڵکو بە پێەوانەوە ئەگەر ئەو بۆچوونە بۆ کۆمەڵگا گەشە ئاسایەکانیش راست بووبێت، ئەوا بۆ کۆمەڵگا دواکەوتوو، پاشکۆو خێڵایەتیەکانی وەکو کورد هەرگیز راست نیە، چونکە فاکتەری بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا لە دەرەوەی فاکتەری ئابوری‌یە. دیارە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئابوری گرنگ نیە یان ناتوانێت ئەو دەورە ببینێت، نەخێر بەڵکو مەبەست ئەوەیە لەم کۆمەڵگایەدا ئابوری لەبەر دواکەوتنی و شێواندنی بە هۆی کاریگەری نالەباری تۆپۆگرافیاوە نەیتوانیووە ئەو دەورە ببینێت.

کوردستان بە وڵاتی چیا بەناوبانگە، ئەمەش بۆ مرۆڤی کورد لە رووی مەعنەویەوە مایەی شانازی پێوەکردن بووەو چیای بەهێمای سەربەرزی و شکۆمەندی زانیووە، بەبێ ئەوەی دەرکی بەوە کردبێت کە ئەو چیایانە هۆی بەشێکی زۆری بەدبەختی‌یەکانی ئەمن وەکو نەتەوەو وەکو

کۆمەڵیش. دابەشبوونی چیاکانی کوردستان دوو خەسڵەتی تایبەتیان هەیە. یەکەمیان بە پانتایی جوگرافیای کوردستان بەهەر ئاراستەیەك چیایەك دەگریت، بە دوایداو زیاتر لە شێوەی هێڵی تەریبدا چیای تر دێت. نێوان هەردوو چیا یان دوو زنجیرە چیا، دۆڵێك، شیوێك یان دەشتێکی مەودا تەسك هەیە کە بواری دروستبوونی چەند گوندێکی بچووکی تێدا بۆتەوە ئەویش بەپێی ئەو زەوی و زارەی کە لەوێدا هەیەو بەپێی ئەو زەوی و زارەی بۆ کشتوکاڵ دەشێت و بەپێی ئەو رێژەی بەرهەم کە تیایدا دەشێ بەرهەم بهێنرێت، هەروەها بەپێی ئەو لەوەڕگاو پاکژەی کە هەیەتی بۆ بەخێوکردنی مەڕومالآت و خەڵکی تێدا دەژی.

خەسڵەتی دووەمی چیاکانی کوردستان ئەوەیە کە ئاراستەیەکی چەق بەستنیان بەرەو ناوەندی کوردستان هەیە. واتە سەرباری ئەوەی کە چەند زنجیرە چیایەکی دیار کەوتوونەتە سەر بەشی زۆری سنوورەکانی کوردستان بەلآم هەتا بە ئاراستەی ناوەندی کوردستان بڕوات لە رووی تۆپۆگرافیاوە سەختتر دەبێت، واتە چەق بەستنی چیاکان بەرەو ناوەند وای کردووە کوردستان لە بەشە ناوەندەکەیدا وەکو قەڵایەکی سەربارزی پتەو خۆی بنوێنێ کە بە چوار دەوریدا بەگشتی و لە باکوورو باشووردا بەتایبەتی بارێکی داخوران یان ئاراستە رۆچوون بۆ دەرەوەی کوردستان هەبێت.. بەشێوەیەکی گشتی ئەتوانین بڵێین کوردو چیا لێك جیانابنەوەو هەر کە دەشت دەستی پێکرد ئیتر کوردەکان بەجێی دێڵن بۆ عەرەب و تورك، تا نزیك دەریاچەی وانیش بۆ ئەرمەنیەکان[1].

ئەم قسەیەش راستی ئەو بۆچوونە دەسەلمێنێت کە کوردەکان رەگەزێکی چیانشینن و بەخۆڕسك ئارەزووی ژیانی نێو ئەو تۆپۆگرافیایان هەیە بۆیە هەر کە دەشت دەستی پێکرد بەجێی دەهێڵن بۆ کەسانی تر. یان ئەوە دەگەیەنێت کە هەر لە بنەڕەتەوە نیشتمانەکەی ئەمان لە چیا پێکهاتووەو خۆیان لەسەر ئەو زەمینەیە ناسیووەو تەنیا ئەوێیان بۆ ژیانی خۆیان هەڵبژاردووە. ئەم بۆچوونە لە کەلتوری کوردی

و تەنانەت لە پانتایی ئەستی کۆمەڵایەتی کوردیشدا جێگای گرتووەو کوردو چیا وەکو دووانەیەکی لێك جیانەکراوە سەیر دەکرێن و تەنانەت تاکو ئێستاش مرۆڤی چیانشینی کورد بە چاوێکی کەمتر سەیری کوردی ناوچە دەشتیە تەسکەکانی کوردستان دەکەن، وەکو ئەوەی پێیان وابێت دەشت یەکێکە لە هۆکارەکانی دواکەوتن.

بە هەرحاڵ سروشتی ژیانیش لە کوردستاندا وەها خوڵقاوەو بەرێکراوە کە ئەو کەسەی لە ئاڵۆزترین زەمینەی جوگرافی ئەم وڵاتەدا ژیابێت بە لە پێشتر پیرۆزتر سەیری خۆیی کردووەو بگرە سەیریشی کراوە، رەنگە ئەمە لە روویەکەوە راستی‌یەکی تێدا بێت چونکە دانیشتوانی شوێنە سەختەکانی کوردستان کە ئەویش ناوچە چیاییە سەختەکان دەگرێتەوە باشتر توانیوویانە پارێزگاری لە رەسنایەتی کوردی و داب و نەریت و سیمای کوردایەتی بکەن بۆ نموونە دەتوانین سەرنجی هەورامان بدەین کە دەشێ لە هەموو شوێنێکی کوردستان زیاتر رەسەنایەتی کوردایەتی تێدا پارێزراوبێت.

لە بارەی سەختی ناوەندی کوردستانەوە مارتن ڤان برۆنسن دەڵێت: ناوەندی کوردستان لە چیای سەخت و یاخی دەست پێنەگەیشتوو پێکهاتووە(٢). ئەمەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات ناوەندی کوردستان کەمتر بۆ ژیان و گوزەران دەشێت چونکە لە ناوچەیەکی وەها سەختتدا نە دەتوانرێت بنەماکانی سەقامگیربوون و ئاوەدانکردنەوە بەدیبهێنرێت، نە دەتوانرێت بەرهەم بهێنرێت لەبەر ئەوە ئەو ناوەندە وەك قەڵایەکی سەخت بەڵام چۆڵ دەمێنێتەوە ئەمەش بۆ خۆی یەکێکە لە هۆکارەکانی لاوازکردنی ناوەند دروستبوون لە کوردستاندا. ئەگەر لە ناوەندی جوگرافی کوردستانەوە بەرەو هەر لایەکی بە ئاراستەی سنوورەکانی برۆیت ئەوا هێدی هێدی رووبەرووی گردو بان و پاشان دەشتەکان دەبیتەوە کە ئەوانیش واتە دەشتەکان باشترین زەمینەن کە لە دێرزەمانەوە مرۆڤیان تێدا نیشتەجێ بووەو گوندو پاشان شاریشیان

تیادا بنیادنراوە. بەڵام بەشی ناوەندی کوردستان لەبەر ئەو شێوە چەق بەستنەی چیاکان و نەبوونی زەوی کشتوکاڵی نەیتوانیوە شار دروست بکات. بگرە بە تەواوی بواری گوند تیا دروستبوونیشی نەبووە ئەویش لەبەر ناڵەباری ئەو پێکهاتە جوگرافیەو نەبوونی زەمینەی لەبار بۆ نیشتەجێبوون ئەمەش بۆتە هۆکارێك بۆ مانەوەی کوردستان لە سنوری داخراوی پاکژو لەوەرگادا کە ئەویش زیاتر خاسیەتی جوگرافیای سروشتی هەیە نەك جوگرافیایەك کە کۆمەڵایەتی بوونی لەسەر دروستبوبێت. دیارە جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژەش بۆ ئەوە بکرێت کە جوگرافیای کوردستان لەبەر زستانی ساردو سڕو هەندێ جاریش کەم باران و دوورو درێژیش لە بەرامبەر هاوینی گەرم و وشك و کەم ئاوو دوورو درێژدا تەنانەت وەکو لەوەڕگاو پاوەندێك پەسەند نیەو لە هەمان کاتدا ئەو بارە دژنەوەی هەردوو وەرزەکە خەڵکەکەی ناچار کردووە گەرمیان و کوێستان بکەن و سامانی ئاژەڵیشی هێندە گەشە سەندو نەبێت.

کۆچ و رەوو گەرمیان و کوێستان کە یەکێك بووە لە خاسیەتە دیارە لەبەرچاوەکانی خێڵایەتی کوردی لە ئەنجامی باری ناڵەباری تۆپۆگرافیاو ئاووهەواو لاوازی لەوەڕگادا دروستبووە. باری سەخت و دوورو درێژی هەردوو وەرزی زستان و هاوین خەڵکەکەی ناچار کردووە گەرمیان و کوێستان بکەن و سامانی ئاژەڵداریش هێندە گەشەسەندو نەبێت کە ببێتە سەرچاوەو بنەمایەکی دەوڵەمەندو بەهێزی داهاتی نەتەوەیی‌و ناوەندی ئابوری دروست بکات. کۆچ و باری گەرمیان و کوێستان بارێکی شلۆقی ژیانی دروستکردووە و مرۆڤی کورد نەیتواووە تێیدا هەست بە پەیوەستبوونی رۆحی خۆی بەخاکەوە بکات لەبەر ئەوەی هەردەم لە کۆچدا بووە، شوێنێکی تایبەتی بە مەنزڵگاو نیشتمانی هەمیشەیی خۆی نەزانیووە؛ هەتا هەست بکات بوون و ژیان و ناسنامەی ئەو بەو خاکەوە بەندە. دەشێ کۆچ و کۆچباری و گەرمیان و

کوێستان لە خێڵایەتی کوردیدا یەکێك لە هۆیە سەرەکیەکانی دواکەوتن و درەنگ سەرهەڵدان و خەملاندنی هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی بووبێت لای کورد. تەنانەت لە قۆناغەکانی دواتریشدا خێڵە کۆچەرەکانی کورد دەورێکی ئەوتۆیان نەبووە لە بەشداری کردنی بزوتنەوەکانی کورددا. بەڵکو بە پێچەوانەوە رابەرایەتی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی کورد لە دوو سەدەی رابرووردا شێخ و رابەرە ئایینییەکان و ئەو ئاغاو بەگانە رابەرایەتیان کردووە کە لە کۆنەوە نیشتەجێ بوون. کەواتە پەیوەندییەکی پێچەوانە لەنێوان گەرمیان و کوێستانی خێڵی کوردو سەرهەڵدانی هەستی نیشتمانی و نەتەوەییدا هەیە.

تۆپۆگرافیای نالەباری کوردستان لەلایەك رێگای لەبەردەم نیشتەجێ بوون و برەوپێدانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریدا تەسك کردۆتەوە. لەلایەکی تریشەوە خودی پێگەی جوگرافی کوردستان لە رووی سیاسیەوە هەر لە دێرزەمانەوە هۆکارێکی سەرەکی بووە بۆ ئەوەی هەرچۆن کورد لەسەر بنەمای پەرەسەندنی کۆمەلایەتی نەیتوانیووە بگاتە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت، بەهەمان شێوە ئەو شوێنە جوگرافیەی کوردستان رێگای نەداوە لەسەر بنەمای بڕیاری سیاسی و لە ئەنجامی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا دەوڵەتی بۆ دروست بکرێت. ئەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی کە کوردستان وەکو خاك لە هەردوو لایەنی تۆپۆگرافیاو شوێنی جوگرافیاوە لەبار نەبووە بۆ پەرەسەندنی کۆمەلایەتی لەئاکامی ئەوەشدا گەیشتنی کورد بە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت، هەروەها لە رووی پێگەی جوگرافیشەوە کەوتنە نێوان کۆمەڵی نەتەوەو دەوڵەتی خاوەن بەرژەوەندییەوە لە کوردستاندا، ئەو شوێنکەوتە سیاسیە بۆتە مایەی دروستکردنی بەربەستێکی گەورە لەبەردەم دروستکردنی دەوڵەتی کوردیدا لە رووی بڕیاری سیاسیەوە.

# پەیوەندی نێوان تۆپۆگرافیاو شێواز نیشتەجێ بوون

مەبەست لە زاراوەی Topography وەسفکردنی یان وێنەی پڕ لە وردەکاری جێگاو زەمینەی جوگرافی و خاسیێتیەکانی رووی زەوی‌یە لەو جوگرافیایەدا. لەسەر ئەو بنەمایە مەبەست لە تۆپۆگرافیای کوردستان شێوازی رووی زەوی کوردستان و پێکهاتەکانیەتی لە چیاو دەشت و گردو بان و دۆڵ و شیو، لەگەڵ خاسیێتیەکانی خاکی ئەو جوگرافیایەو ئاستی گونجاندن و لەباری بۆ ژیان و تێدا نیشتەجێ بوون.

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە تۆپۆگرافیای کوردستان لە چیای سەختی یەك بەدوای یەکدا پێکهاتووە کە لە نێوانیاندا بان و گردو دۆڵ و شیو و هەندێ جاریش دەشتی مەودا تەسك هەیە کە لە دامێنی ئەو چیایانەداو بەتایبەتیش لە دۆڵ و شێوەکاندا کانی و سەرچاوەی ئاو هەیە کە زۆربەی زۆری گوندەکانی کوردستان لەسەر ئەو کانی و سەرچاوە ئاوییانە دروست کراون. هەر لێرەشەوە دەردەکەوێت کە یەکێك لە هۆیە هەرە سەرەکیەکانی نیشتەجێ بوون لەهەر جێگایەکدا بوونی سەرچاوەی ئاوە.

ئەم بارەی تۆپۆگرافیای کوردستان بۆتە هۆکاری پەرتبوون و دابڕان و لێکتر دورکەوتنەوەی خێزان و بنەماڵەو هۆزو تیرەکانی خێڵێك لە یەکتری. ئەمە جگە لەوەی کە بە تەواوی سنووری نێوان دوو خێڵ جیاوازی نێزام ئەو دوو خێڵەی دیاری کردووە. ئاستی ئەم پەرتبوونە لە پلەیەکدا بووە ئەو پەیوندیو خەسڵەتانەی کە لە سروشتی پەیوەندی

خێڵدا هەن و سەرجەم لە سنووری پەیوەندی خوێن و دەمارگیریدا کۆدەبنەوە لاواز بێت. دیارە پەیوەندیەکانی خوێن و دەمار هۆکاری رۆحی و مەعنەوی پێکەوە بەستنی هەموو ئەندام خێزان و بنەماڵەو هۆزو تیرەکانی خێڵە پێکەوە. بەهێزبوون و پتەوی پەیوەندی خوێن و دەمار یان خزمایەتی دەبێتە هۆی بەزاندنی سنووری بەرژەوەندی تایبەتی تاکە ئەندامی خێڵ و لە پێناوی بەرژەوەندی یەکەیەکی گەورەتردا ئیش دەکات کە ئەویش لە پلەی یەکەمدا بەرژەوەندی پێکهێنەرەکانی خێڵە لە بنەماڵەو تیرەو لە پلەیەکی بەرزتریشدا بەرژەوەندی خێڵە، بەڵام دیارە لە پەیوەندی خێڵایەتیدا بەگشتی و لە خێڵایەتی کوردیشدا بەتایبەتی بەرژەوەندی خێڵ لە سنووری بوون و دەسەڵات و سنوورو جوگرافیای خێڵ خۆیدا تەواو دەبێت و نەك هەر ناپەڕێتەوە بۆ دەرەوەی خێڵ و بۆ هاریکاری لەگەڵ خێڵەکانی تردا بەڵکو دژو ناکۆك و ناتەباش لەگەڵ بەرژەوەندی خێڵەکانی ترداو زۆربەی کات لەبری پەیوەندی و هاوکاری، ناکۆکی و دوژمنایەتی هەیە لە نێوان خێڵە جیاوازەکاندا بە واتا پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی تەنیا لە سنووری دامەزراوی تاکە خێڵێکدا هۆی یەکگرتن و یەکێتی و یەکبوونن، ئەگینا لە سەرجەم پانتای خێڵایەتیدا ئەگەر گۆڕانکارییان بەسەردا نەیەت و بەرەو بڵندبوون نەچن ئەوا ناتوانن ببنە هۆکاری لێکترنزیك بوونەوە، دیارە ئەمەش یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی پەرتبوون و لێکتر دوورکەوتنەوە لە نێوان خێڵەکانی کورددا. دیارە بەلاوەنانی کەسێتی (تاك) لە سنووری دامەزراوی خێڵداو تواندنەوەی لەنێو ئەو دامەزراوەیەدا بنیادنەری پێکهاتەی کۆیی و عەقڵی دەستەجەمیەو بکوژو لەنێوبەری گەوهەرو ماهیەتی تاکەکەسە لەناو خودی دامەزراوەکەداو بوونی تاك بەبوونی دامەزراوە خێڵایەتیەکەیەوە بەندەو لە دەرەوەی بنەماڵەو تیرەو خێڵ جگە لە سەرخێڵ هیچ تاکەکەسێکی تر ئامادەبوونی نیە. تاکی بێ ئەسڵ و رەگەز لەنێو کۆمەڵگای خێڵایەتیدا توانای

دەرکەوتنی نابێت و بگرە دەشسڕێتەوە. لەم بارەیەوە دکتۆر محەمەد عابد جابری دەڵێت: هەستکردنی تاکەکەس بەوەی کە بەشێکی جیانەکراوەیە لەو خێڵەی کە ئەندامە لێی کۆبوونەوەیەکی مەعنەویەو لەو تاکەکەسەشدا هەمیشە ئامادەبوونێك هەیە پاڵی دەنێت بۆ بەرجەستەکردنی ئەو ئینتیمایە ئەویش بە تواندنەوەی کەسێتی خۆی کەسێتی خێڵەکەی وەردەگرێت(٣). ئەمە حاڵەتێکی گشتییە لە دامەزراوی خێڵایەتیداو بگرە یەکێك لە هۆیەکانی پاراستنی دامەزراوی خێڵە چونکە ئەگەر ئەندامانی هەر خێڵێك دروست دەکەن کە لە ئەنجامی هەست کردن بە بوونی خۆیدا هەنگاوی بەرەو یەککگرتن و دروستکردنی فیدراسیۆن بنێت، چونکە تەنیا کاتێك خێڵەکانی کۆمەڵگایەك دەتوانن یەکبگرن و فیدراسیۆن دروست بکەن کە هەست بە بوونی کەسێتی سەربەخۆیی خۆیان بکەن.

بەهەرحاڵ ئەو هۆکارەی کە بووە بە بەربەست لەبەردەم گەشەی سروشتی خێڵایەتی کوردیدا لە پلەی یەکەمدا شێوازی ناسروشتی دابەشبوونی خێزان و بنەماڵەو تیرەکانی تاکە خێڵێکە لە کوردستاندا، ئەویش بەهۆی نالەباری تۆپۆگرافیای کوردستانەوە، بێگومان هەر ئەو شێواندنە لە سروشتی خێڵایەتی کوردیدا بووەتە هۆی شێواندنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردی.

هەروەك ئاشکرایە باری ئاڵۆزی تۆپۆگرافیای کوردستان ڕێگای نەداوە سەرجەم ئەندامانی خێڵێك یان تیرەیەك یان تیرەکانی ئەو خێڵە یان بنەماڵەکانی عەشیرەتێك پێکەوە لە ناوچەیەکی دیاری کراودا بژین بەڵکو ئەو بارە نالەبارەی ژینگە پەرت و بڵاوی کردوونەتەوەو تەنها بنەماڵەیەك یان تیرەیەك لە شوێنێکی دیاردا ژیانیان گوزەراندوەو نیشتەجێ بوون، بگرە ئەم حاڵەتە بۆ خێڵی کۆچەری کوردیش راستە چونکە ئەویش بەپێی قەڵەمڕەوی گەرمیان و کوێستانی خۆیان بەسەر چەند ناوچەیەکدا دابەش بووەو ئەوەش بۆتە هۆی زیاتر پەرتکردن و لە یەکتر

دوورخستنەوەی بەشەکانی ئەو خێڵەو وایلێکردووە لە یەکەیەکی بالاوە بگۆڕێت بۆ چەند یەکەیەکی بچووکتر چ لە رووی ژمارەو چ لە رووی ئەو پانتاییە جوگرافیەی کە تیایدا ژیاون چ لە رووی تەسکتر کردنەوەی پەیوەندیانەوە لە سنووری خۆیاندا، شێوەی پەیوەندی (یەکە دابەشبووەکانی خێڵ لە تۆپۆگرافیای نالەباری کوردستاندا: پەیوەندییەکی خێزانی بووە لەسەر بنەمای هاریکاری و خزمەتی یەکتری بنیادنراوە (لە سنووری خۆیاندا). زیاتر جێگیربوون و چەسپاندنی ئەم پەیوەندییە خێزانیە (کە پەیوەندی خوێنە) بۆتە هۆی پەرتکردنی پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای خێڵایەتی و داخستنیان بە رووی خۆیاندا(٤). ئەم پەرت بوونەش تەنها هەر ئەوە نەبووە لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە کاریگەری نێگەتیڤی هەبووبێت و بەربەست بووبێت لە رێگای گەشەسەندندا بەڵکو لەرووی سایکۆلۆژیشەوە گیانی تاکڕەویی و پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی و خۆ بە پاڵەوان بینینی دروستکردووە، ئەگەرچی لە سنووری دامەزراوی خێڵدا "تاك" بەتەنیا بوونی نیەو بوونی بەندە بە بوونی خێڵەکەیەوە. ئەو تاکڕەوییەی کە لە سنووری پێکهاتەکانی خێڵی کوردیدا دروست بووە، تاکڕەوییەك بووە کە دواجار ئەو ژمارە کەمەی چەند خێزان و بنەماڵە، یان تیرەیەك تەنها خۆیان ناسیووەو تەنهاش پشتیان بەخۆیان بەستووە لە دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ژیانیاندا، لە بەگژاچوون و بەرامبەر وەستانی سروشتی سەخت و نالەباری کوردستاندا، ئەو سروشتەی کە رۆحی کوردی کوشتووەو هەموو هێزو تواناو وزەی کورد لەنێو ئەودا لە پێناوی دابین کردنی ژیاندا خراوەتە کار.

کاریگەرییەکی تری نیگەتیفی پەرتبوونی پێکهاتەکانی خێڵی کوردو دابەشبوونیان بەسەر کانی و سەرچاوەکانی ئاوو دەشتە مەودا تەسکەکاندا روانینێکی هێجگار تەسکی لای مرۆڤی کورد دروست کردووە. بەجۆرێك وا لە خۆیان روانیووە کە خۆیان بە پاشاو سەروەری

ئەو ناوچە تەسك و بچووكە زانیووە كە ژیانیان تیادا گوزەراندووەو ئەم حاڵەتەش ئەوەی لا دروست كردوون كە هەریەكە لە جێگای خۆیدا خۆی بە هەموو شت بزانێ و لە ئەكامی ئەوەشدا نەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەرەكەیدا ئاڵوگۆڕ بكات، ئەمەش یەكێكە لەو هۆكارانەی كە كۆمەڵایەتی بوونی كوردی لە بنەڕەتەوە لاواز كردووەو بەوەش شێواندنی لە سروشتی كۆمەڵایەتی بوون و بەوپێیەش شێواندن لە پەرەسەندنی كۆمەڵایەتیدا روویداوە. ململانێی سەختی مرۆڤی كورد چ لە سەردەمی پێش نیشتەجێ بووندا و چ لە دوای نیشتەجێ بوونیش لەگەڵ سروشتی ئاڵۆزو تۆپۆگرافیاو كەش و هەوای نالەباردا و بەوپێیەش بەزەحمەت بەدەست هێنانی هۆیەكانی ژیان یان جۆرە گانێكی مل نەدان و دان بەخۆدا گرتن و نەبەزینی لە مرۆڤی كورددا دروستكردووە بە جۆرێكی ئەوتۆ كە ئەم حاڵەتە بۆتە بەشێك لە (كۆنەست) و لەوێشەوە عەقڵی تەسك و مەودا كورتی كورد دروستبووە كە پێشتر بە عەقڵی خێڵ(٥) ناودێرمان كردووە، كە ئەویش عەقڵێكە تەنها خودی خۆی دەناسێ و دەبینێ و توانای گفتوگۆكردن و ناسینی دەرەوەی خۆیی نیەو مل بۆ هیچ شتێك نادات مەگەر هێز كۆنترۆڵی بكات. نە دەتوانێت دان بە ئەوانی تردا بنێت. دایەلۆگ و ڕێك كەوتن لەگەڵیدا كارێكی چاوەڕوان نەكراوە. ئەگەر روویشیدا ئەوا ڕێژەیەكی زۆر نزمەو تەنانەت ناشێت بە ئاسانی لە قۆناغی ئایندەی شاردا ڕێگای پیادەكردنی دەسەڵات بەسەریدا بدات، كە ئەوەش خاڵی یەكەمی پێكهاتنی سیستەمی كۆمەڵایەتی شارە، پەیوەندی شار ئەگەر بە راستی بنەماكانی شار بە سروشتی دروست بووبێت لەسەر بنەمای تواناو بوونی تاكەكەس خۆی بنیاد دەنرێت و هێزیش هەمیشە بە دەوری تاك و چین و گروپ و حیزبی خاوەن كەسێتدا كۆدەبێتەوە واتە پەیوەندی شار خاوەن هێز دەیسەپێنێ كە ئەویش لە رژێمی فەرمانڕەوایدا خۆی دەبینێتەوە. لەبری ئەوەی كە پەیوەندییەكانی خوێن و خزمایەتی

بالادەست بێت و هەموو جوڵەو بڕیارو لە هەمان کاتدا وابەستەبوونێکیش لە سنووری جەستەی خێڵدا بمێنێتەوە، بەڵکو دەگۆڕێن بۆ پەیوەندی بەرەو دەرەوەی جەستەی خێڵ. بۆیە پەیوەندی خێڵایەتی لە کۆمەڵگای شاردا تێکدەشکێ و دەبێتە کۆنەستێکی سەرکوتکراو کە لە ڕێگای پلان و نەخشەی دژەوە گوزارشت لە خۆی دەکات، ئەویش لە یاخی بوون و تاوانکردن و کوشتندا بەشێوەو ئامرازی نادروست و جۆراوجۆر بەپێی دۆزینەوەکانی تەکنەلۆژیای هاوچەرخ گوزارشت لە خۆی دەکات(٦). دیارە ئەوە شێوازی سروشتی گەشەکردن و گواستنەوەیە لە سیستەمی خێڵایەتییەوە وەکو سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بۆ سیستەمی شارستانی. بەڵام ئەوەی کە ئێمە مەبەستمانە لێی بدوێین لێرەدا شێواندنی ئەو ڕەوتە سروشتیەی گەشەکردنی کۆمەڵگا کوردەوارییە لەژێر کاریگەری تۆپۆگرافیای ناڵەباردا.

لەباری ناڵەباری تۆپۆگرافیای کوردستان و بەرزی و نزمی خاکەکەیەوە دیارە گۆڕانە جیۆلۆجیاکان لە دێرزەمانەوە دەوریان لەو بوارەدا بینیووە.. بەتایبەت جوڵەکانی ئۆرجینی- ئەلپی و کەوانەو زنجیرە چیای وەك چیاکانی ئەلپ و تۆرۆس و هیمالایاو.. ئەوانی لێ پەیدابووە، بۆیە دەتوانین ئەو ناوچەیە وا وەسف بکەین کە بریتیە لە پێچی قۆقز کە پێچ و دۆڵی رووچاڵیان دەکەوێتە نێوانەوە(٧). ئەم گۆڕانە جیۆلۆجیانە بەدرێژایی ملیۆنان ساڵ تۆپۆگرافیای ئەم ناوچەیان پێکهێناوە، کە لە کوردستاندا پێکهاتەی چیایی لە شێوەی زنجیرەی یەك بەدوای یەکدا پێکهاتووە کە سەرباری لۆچ و شیو و دۆڵ لە سنووری یەك زنجیرەدا، لەنێوان هەر زنجیرە چیایەك لەگەڵ زنجیرەی ئەم دیو ئەو دیوویدا دەشت دروستبووە کە هەتا بە ئاراستەی ناوەندی کوردستان بکشێت ئەوا زنجیرە چیاکان لێکتر نزیکتر دەبنەوە بەجۆرێکی ئەوتۆ کە نێوان دوو زنجیرە چیا ئەوەندە تەسك دەبێتەوە کە سەرباری بەپیتی ئەو زەویانە

بەڵام پانتاییەکی کەمن بۆ کشتوکاڵ و بەوپێیەش بوارێکی تەسك و ناڵەبارن بۆ نیشتەجێ بوون. پێم باشە تەنیا سەرنجی بەشێك لە زنجیرە چیاکانی باشووری کوردستان بدەین هەتا بزانین کە چۆن لەرووی ئاراستەوە هاوئاراستەن و چۆنیش زنجیرە بەدوای زنجیرەدا دێن لەسەر شێوەی هێڵی تەریب. بۆ نموونە زنجیرە چیاکانی سەگرمە، بازیان، هەیبەت سوڵتان، باواجی، پیرمام، ئاکرێ، بێخێر کە ئەم زنجیرەیە لە رۆژهەڵاتەوە لە بەرامبەر زنجیرەی بەمۆدا دەوەستێ و لە رۆژئاواشەوە درێژدەبێتەوە بۆ نێو رۆژئاوای کوردستان، بەڵام ئاراستەکەی بەرەو دابەزینە، لە کاتێکدا لە باشورداو بەرەو رۆژهەڵات زنجیرە چیا تەریبەکانی هەورامان و رۆژهەڵاتی کوردستان بەرەو ناوەندی کوردستان ئاراستە ریزبوونێکی تەریبی تریان هەیە کە تا ئەندازەیەك تەریب نین لەگەڵ چیاکانی باشووردا. بێگومان لە باکوریشدا دیسان زنجیرەی تەریبی یەك بەدوای یەکی چیاکان بەرەو ناوەند بەردەوامە کە تا لە ناوەندیش نزیك بێتەوە هەم چیاکان سەختتر دەبن هەم ماوەی نێوانیان تەسکتر دەبێتەوە کە دەشێ لە بازنەی ناوەندی کوردستاندا نزیکی چیاکان لێکترەوە شێوەی بانێکی چیایی دروست بکات و لە ناوەندا کوردستان وەکو قەڵایەکی سەختی لێ بێت.

وەك ئامارەمان بۆ کرد باری چەق بەستنی زنجیرە چیایەك لەدوای یەکەکانی کوردستان بەرەو ناوەندو لەهەمان کاتدا داخورانی رووی تۆپۆگرافیای ئەم جوگرافیایە بەرەو دەرەوە لە خاسێتە دیارەکانی تری تۆپۆگرافیای کوردستانن چونکە هەتا بەرەو سنووری دەرەوەی کوردستان برۆین سەختی چیاکان کەم دەبێتەوە دیارە ئەوەش پەیوەندی بە گۆرانە جیۆلۆجیەکانەوە هەیە کە ئەویش لە دەرەوەی ئامانجی ئەم باسەدایە بەڵام ئەوەی لەرووی لێکدانەوەی کۆمەڵایەتیەوە گرنگە دەوری ئەو شێوازەی تۆپۆگرافیایە لەسەر کاریگەری ژینگەو تۆپۆگرافیا لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی. هەر بۆ

زیاتر ئاشکراکردنی سروشتی تۆپۆگرافیا لە باشووری کوردستانەوە..
تا رووەو باشوورو باشووری رۆژئاوای هەرێم بچین، واتا بەرەو ناوچەی نیمچە شاخاوی، رادەی بەرزی و نزمی زەوی کەم دەبێتەوە(٨) ئەمەش سیمای جۆرێك لە داخورانی تۆپۆگرافیای کوردستان بە ئاراستەی دەرەوە نیشان دەدات کە ئەو داخورانەش گەلێك جێکەوتی خراپی لەسەر شێوازی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی هەبووە کە دواتر باسیان دەکەین. بێگومان لە جوگرافیایەکی لەبارو تۆپۆگرافیایەکی گونجاودا کە سروشت بەربەستی سەختی لەبەردەم ژیاندا دروست نەکردبێت ئەوا هەر لە قۆناغەکانی سەرەتای ژیانی مرۆڤداو مرۆڤ لەگەلٚ کۆمەلایەتی بوونیدا بەرەو نیشتەجێ بوون چووە چونکە تۆپۆگرافیای لەبار یارمەتی زوو سەقامگیربوونی داوە. ئێمە تاکو ئێستا لەبەر لاوازی ئاستی تۆمارکردنی رابردووی کورد نازانین قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانی چۆن بووە، چۆن لە سەرەتای ژیانیدا ژیاوە، چۆن یەکەمجار نیشتەجێ بووە، شێوازی ژیانی سەرەتاو دروستبوونی خێزان لەلای ئەم رەگەزە چۆن بووە، چۆن دەستە کۆمەلایەتیەکان لە توێژو چینەکان پێکهاتووە، ئەگەر لە روانگەی چەمکی مارکسیزمەوە بروانین کە مێژووی مرۆڤایەتی مێژووی ململانێی چینەکان بووە. لە بارێکی تریشدا ئایا هەست کردن بە هاوخوێنی و هاودەماری واتە پەیوەندییەکانی خزمایەتی لە سنووری بوونی ئەم رەگەزە مرۆڤیەدا لەکەیەوە دەرکەوتووەو هەستی پێکراو، بە مانایەکی تر ئایا دامەزراوی خێلٚ و سەرەتای دروستبوونی لەم کۆمەلٚگایەدا دەگەرێتەوە بۆ کەی؟ دیارە هەروەك لە باسێکی پێشتریشدا ئاماژەمان بۆ کردووە قسەکردن لەسەر کۆمۆنەی سەرەتایی و سیستەمی کۆیلایەتی کوردی مایەی گومانە. هەلٚبەت ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە کورد باری ژیانی کۆمۆنەی سەرەتایی و ژیانی کۆیلایەتی نەبینووەو پێیدا تێنەپەریووە، نەخێر بەلٚکو مەبەستمان لەم قسەیە ئەوەیە کە لە مێژووی کۆمەلایەتی کوردیدا قسەکردن لەسەر بوونی ئەو سیستەمە

کۆمەڵایەتیانەی وەکو سیستەمی کۆیلایەتی و تەنانەت سیستەمی فیودیالیش بەھەموو سیماکانیەوە شایانی گفتوگۆو ئاخاوتن لەسەر کردنن.

بەڵام ئێمە زیاتر لایەنگری لێکدانەوەیەکی تر دەکەین بۆ تۆژینەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی کوردی کە ئەویش ئەوەیە کۆمەڵگای کوردی لەوکاتەوە مێژووی بوونی دیارە کە جۆرێك لە سیستەمی خێڵایەتی لاوازی پێکھێناوە بە مانایەکی تر مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا لە سەرەتاوە بۆ ئێستا مێژووی پەیوەندی و ملمالانێی خێڵەکانە لە پێناوی بوون و سەلماندنی خۆیاندا، دیارە بزوێنەری خێڵایەتی و بنەمای دروستبوونی خێل پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتیە، ھەر لەم روانگەشەوەیە کە ئێمە پێمان وایە لە کۆمەڵگای کوردیدا پەیوەندییەکانی خوێن و دەمار واتە خزمایەتی جێگای پەیوەندییە ئابورییەکانیان گرتۆتەوەو لەبری فاکتەری ئابوری بزوتنەوەی مێژوو بریتییە لە پەیوەندییەکانی خزمایەتی، ئەم قسەیەش نەك بۆ رابردوو بەڵکو بۆ ئێستاش راستە. ھۆی سەرەکی شێواندنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردیو نەگەیشتنی کورد بە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت لە روانگەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیەوە پەیوەندی بەوەوە ھەیە کە ئابوری نەیتوانیووە ھاوشان لەگەڵ ملمالانێی چینایەتدا دەوری بزوێنەری مێژوو ببینن بەڵکو پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی جێگای ئابوری گرتۆتەوە، پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتیش پەیوەندی ناسروشتی و نائاسایی بوون لە کۆمەڵگای کوردیدا ئەوەش بەھۆی کاریگەری تۆپۆگرافیاوە ھەر بۆیە نەیانتوانیووە کورد بگەیەننە ئاستی دروستکردنی دەوڵەتی خێڵ ھەمان شێوەی کۆمەڵگا خێڵایەتیە گەشە ئاساییەکان.

لە کاتێکدا کە مێژووی زانراوی کورد مێژووی خێڵایەتی کوردی بێت کەواتە جێگای خۆیەتی سەرنجی شێوازی نیشتەجێبوونی خێڵەکانی

کـورد بدەیـن لەسـەر جوگرافیـای کوردسـتان و لـەژێر کاریگـەری تۆپۆگرافیای کوردستاندا. دیارە لێرەشدا باسی ژیانی کۆچەری ناکەین کە هەتا ناوەڕاستی سەدەی بیستیش هەر بەردەوام بووە، بەڵکو باسی شێوازی نیشتەجێبوون دەکـەین لـە کوردسـتاندا ڕاتـە چـۆن خـەڵك لـە جێگایەکدا کۆبوونەتەوەو گوندیان دروستکردووە. ئەوەش ئاشکرایە کە زۆرێك لە سەرچاوە مێژووییەکانی کوردستان بە وڵاتێکی هێجگار کۆن دادەنێـن لـە روانگـەی مانـەوەی گـەلێك پاشمـاوەی دێرینـەوە، ئـەوەش بەڵگەیەکی باشە بۆ سەلماندنی ڕەسانەیەتی کورد لەسەر خاك و زێدی خـۆی، بـەلام دیسـان ئـەو پاشمـاوە کۆنانـە پێمـان نـاڵێن کـە کـورد لـە رابـردوودا خـاوەنی شارسـتانێتی گـەورە بـووە بـەڵکو دەتوانـن ئـەوە بسـەلمێنن کـە کـورد لـە دێرزەمانـەوە لـەم ناوچەیـەدا ژیـاوەو توانـای نیشتەجێ بوونی هەبووەو پێداویستیەکانی ژیانی لە قوڕو بەردو دار دروست کردووە. هەروەها هەندێ پاشماوەی قـەڵاو جێگـای کۆن لە کوردستاندا دەیسەلمێنن کە نیشتەجێ بوون مێژوویەکی کۆنی هەیە لەم ناوچەیـەدا. لـە بـارەی بەرجەستەبوونی سیمای نەتەوایـەتی کوردیەوە بۆ یەکەمجار دکتۆر جەمال رەشید دەڵێت: خێڵە کیریتیـەکان رۆڵێکی دیارو گرنگی مێژووییـان بینووە لـە بەهێزکردنی ئـەو بنەمایەی کە سەرەتای دەرکەوتنی دیاردەی نەتەوایەتی دیـارو گرنگی مێژووییـان بینووە لە بەهێزکردنی ئەو بنەمایەی کە سەرەتای دەرکـەوتنی دیـاردەی نەتەوایـەتی و شارسـتانی گـەلی کـوردی لـە چـەندین سـەدەی ژیـانیدا چاندووە(٩). ئەمە بەلای نووسـەرەوە کۆنـترین سـەرەتای راستەوخۆی چاندنی سیمای نەتەوایەتی بوونی کوردە ئەگەرچی بەلای نووسەرەوە ئەم خێڵانە باپیرەی کورد نین: کیریتیەکان بریتین لە بەشێك لەو کۆمەڵە مرۆییانەی کـە کوردسـتانیان کردۆتـە جێگـای دانیشـتنی خۆیـان و لـە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژووی کورددا رۆڵـی خۆیـان بینـووە ئـەگینا ئەمان باپیرەی راستەوخۆی کورد نین(١٠) لێرەدا ئەوەی بۆمـان ئاشـکرا

دەبێت ئەوەیە کە پێش ئەوەی باسی راستەوخۆی جێگیربوون و نیشتەجێ بوونی کورد بکەین لە کوردستاندا کەسانێکی تر ژیاون و نیشتەجێ بوون، بەڵام باسی شێوازی نیشتەجێ بوونەکەیان ناکرێت بەڵکو ئەوەی گرنە ئەو کۆمەڵە خەڵکانەش بە کۆمەڵە (خێڵێك) ناودەبرێن کەواتە لەگەڵ باسکردنی کۆنترین سەرچاوەی مێژووی وڵاتی کوردستاندا ناوی دامەزراوی خێڵ دێتە پێشەوە ئەمەش زیاتر یارمەتی سەلماندنی ئەو بۆچوونەمان دەدات کە پێمان وایە مێژووی تۆمارکراو و زانراوی کورد مێژووی خێڵایەتیە. هەر لە بارەی زیاتر سەلماندنی خێڵایەتیەوە لەم ناوچەیەدا جارێکی تر دکتۆر جەمال رەشید دەڵێت. خێڵە میدیەکان لە سەدەی حەوتی زاینەوە هاتوونەتە ئەم ناوچەیە(١١) لە بارەی شێوازی ژیانی میدیەکانەوە هیرۆدۆتس دەڵێت: خێڵە میدیەکان دوو بەشن. ئەوانیش نیشتەجێ و کۆچەرین(١٢) کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە کورد پێش بیست و حەوت سەدە بەشێکی نیشتەجێ و سەقامگیر بوون، بێگومان ئەوەش ئاشکرایە کە لە دروستبوونی دەوڵەتی میددا جۆرێك لە یەکێتی و یەکبوونی خێڵەکانی کورد دروستبووە کە سیمای دیارترین فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردیە لە مێژووی کۆمەڵایەتی کوردیداو لەوکاتەوە تاکو ئێستا فیدراسیۆنێکی تری دیاری خێڵایەتی کوردی پێك نەهاتووە کە شایانی باس بێت.

هەر لەیەکەم نیشتەجێ بوونی کوردەوە لە مێژووی زانراودا مێژوو، مێژووی خێڵەکان و ژیانی خێڵایەتی بووە، واتە دامەزراوی سەرەکی لە کۆمەڵگای کوردیدا دامەزراوی خێل بووە. کەواتە خێڵ لە نیشتەجێ بووندا چی بەسەرهاتووە چۆن لە تۆپۆگرافیای نالەباری کوردستاندا خێڵەکان نیشتەجێ بوون؟ دیارە گومان لەوەدا نیە کە کورد لە یەکەیەکی سادەو سەرەتاییەوە هاتووە کە دەشێ لە خێزانێکەوە دروست بووبێت بەتایبەتی لەدوای نیشتەجێ بوون لە جێگایەکدا وەکو یەك خێزان بووبن. هەرچۆن لە فۆلکلۆری کوردیدا لە زمانی کوردەوە دەڵێت: ئێمە

بەرەیەك بووین(١٢). واتە یەك خێزان بووین، دواتر لەگەڵ زیادبوونی ژمارەیاندا بەدوای بژێوی ژیاندا پەرش و بڵاوبوونەتە چونکە شوێنی نیشتەجێ بوون لە کوردستاندا بەهۆی نالەباری تۆپۆگرافیاوە بواری ئەوەی نەداوە کە سەرباری زیادبوونی ژمارەی ئەندامانی یەکەم خێزان یان یەکەم بەرە هەموو هەر لە جێگایەکدا پێکەوە بژین چونکە نە زەوی بەشی ئەوەی کردووە کە هەرچەندە ژمارەکە زیاد بێت ئەوا هێشتا بەشی کشتوکاڵی هەموویان بکات و بتوانن لەسەری بژین، نە لەوەڕگاش بەشی ئەوەی کردووە کە هەرچی ئاژەڵی ئەو نەوەیە هەیە پێکەوە لەسەری بژین، بۆیە بە ناچاری لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی ئەندامانی ئەو بەرەیەدا هەر کۆمەڵە خێزانێك کە زیاتر لە یەکترەوە نزیك بوون روویان لە جێگایەك کردووە بۆ ئەوەی تێیدا نیشتەجێ ببن و لەسەری بژین. ئەگەرچی لە بارە سروشتییەکەیدا خێڵ و عەشیرەت بەهەموو پێکهاتەکانیانەوە یەکەیەکی سەربەخۆن و لە جوگرافیایەکی دیار کراودا دەژین. کۆمەڵە خێڵایەتیە بچوکەکان وەکو خێل و عەشیرەت و بنەماڵە زیاتر شوێنی تەسك و سنوردار بۆ خۆیان دیاری دەکەن و لەسەری دەژین(١٤). بەڵام تۆپۆگرافیای کوردستان شێواندنێکی تەواوی لە بنیادی پێکهێنەری خێل و عەشیرەتەکانی کورددا کردووە، ئەمەش هەر لە سەرەتای نیشتەجێبوونەوە دەستی پێکردووەو لە قۆناغەکانی دواتریشدا ئەگەرچی شار لە کوردستاندا دروستبووە بەڵام پەیوەندی شار دروست نەبووە هەتا سەرجەم سیماو خاسیەتیەکانی خێڵایەتی لەسەر بنەمای گۆڕینی دامەزراوەکانی خێڵ بۆ دامەزراوی شار هەڵبوەشێنێتەوە.

ئێمە وای بۆ دەچین هەر لە ساتەوەختی نیشتەجێبوونی کوردەوە، کۆمەڵگای کوردی پێکهاتەیەکی خێڵایەتی هەبووبێت و بەڵگەکانیش لە مێژووی زانراودا زیاتر ئەوە دەسەلمێنن کە باشترین نموونەشیان دەوڵەتی میدە کە ئەو دەوڵەتە لە کۆمەڵە خێڵێك پێکهاتووە، ئەمەش

ئەوەمان بۆ دەردەخات کە کۆمەڵگای کوردی لە مێژووی زانراودا مێژووی چینایەتی و ململانێی چینایەتی تێدا نەبووە هەر بۆیە دەشێ ئەم کۆمەڵگایە ڕاستەوخۆ لە کۆمۆنەی سەرەتاییەوە گواسترابێتەوە بۆ چەند پێکهاتەو دامەزراوێکی بچووک بچووکی لەیەک جیاواز ئەو دامەزراوەش دامەزراوی خێڵ و عەشیرەت بووبن، هەر ئەم لێکدانەوەش وامان لێدەکات کە وای بۆ بچین کورد بە قۆناغی کۆیلایەتیدا وەکو قۆناغێك کە خاسیەتیەکانی قۆناغی هەبووبێت و سیستەمی کۆمەڵایەتی کۆیلایەتی دروست بووبێت تێنەپەڕیووە. هەر لەسەر ئەو بنەمایەش دەبینین کە تێکەڵاوییەکی تەواو لەنێوان خێڵایەتی و فیودیالی کوردیدا هەبووەو بەشێوەیەکی گشتیش خاسیەتە کانی خێڵایەتی بالادەست تر بوون بەسەر خاسیەتیەکانی فیودیالیدا بۆیە قۆناغی فیودیالی کوردی زیاتر وەکو قۆناغی خێڵایەتی دەردەکەوێت و لەبری ئەوەی پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنانی خێڵایەتی بالادەست بن پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی بالادەست بوون و تاکو ئێستاش بنەمای سەرەکین لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان کوردا.

واتە دەتوانین بڵێین قۆناغەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا بەو شێوەیە نەهاتوون کە لە کۆمەڵگا گەشە ئاساییەکاندا هاتووەو هەر قۆناغە خاوەنی سەرجەم سیفات و خاسیەتە بنەڕەتیەکانی خۆی بووە. بەڵکو لێرە سەرجەم قۆناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا بەنێو یەکداچوون و نە هیچ قۆناغێك بە تەواوی خاسیەتەکانی خۆیی وەرگرتووە نە لە رووی بنیادی کۆمەڵایەتیشەوە بنەمای پێکهاتنی چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکانی ئەو قۆناغەیە خەملاوە. هەرچۆن خێڵەکانی کورد لە قۆناغێکی دیاریکراودا نیشتەجێ نەبوون و تاکو قۆناغێکی زۆر درەنگیش بەشی زۆریان هەر لە گەرمیان و کوێستان بەردەوامبوون، لە ڕاستیشدا نیشتەجێ بوونی خێڵە کۆچەرییەکانی کورد لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا لە ئەنجامی دروستبوونی پەیوەندییەکانی شاردا نەبووە

بەڵکو لەژێر کاریگەری هۆکارە سیاسیەکان و بارودۆخی سیاسی دژوارو ململانێی نێوان دەوڵەتانی ناوچەکەدا نیشتەجێ بوون.

شێواندنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردی کە لە بنەڕەتەوە پەیوەندی بەیەکەم سەرەتاکانی نیشتەجێ بوونەوە هەیە، واتە پەیوەندی بە دابەشبوونی پێکهێنەرەکانی یەکە سەرەتاییەکانی دروستکەری ئەم کۆمەڵگایەوە هەبە، واتە دابەشبوونی خێل و عەشیرەتەکان بەسەر چەندین ناوچەی جیاوازو لەیەکتر پەرتبووداو ئەوەش بۆتە هۆی لاوازکردنی پەیوەندبیەکانی خوێن و خزمایەتی بەلایەکەوەو لەلایەکی تریشەوە ئەو دابەشبوون و پاشان نیشتەجێ بوونە لە شوێنی دور لەیەك و پەرەوازەدا بۆتە هۆی لاوازی ئاستی کۆمەڵایەتی بوون و جۆرێك لە گۆشەگیری و تەنگەنەفەسی و کورت بینی دروستکردووە کە ئەنجامی ئەوەش کاریگەری و ئاسەواری خراپی لەسەر رەوتی سروشتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی هەبووە.

ئێمە هەرچۆن نازانین کورد لە سەرەتاوە چۆن و کەی و لەکوێدا وەکو یەکەیەکی سەربەخۆ دەرکەوتووە، دیسان نازانین مێژووی یەکەم نیشتەجێ بوونی کەیە، بەلام لە روانگەیەکی گشتی لێکدانەوەی قۆناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە قۆناغی شوانکاری بە گوێرەی کۆمەڵگاکانی دنیا خاوەنی خاسێت و بنەمای تایبەتی خۆی بوورەو بەگوێرەی هەندێ کۆمەڵگا شوانکاری وەکو سیستەمێکی کۆمەڵایەتیشی لێهاتووە، لە بارەی کۆمەڵگای شوانکارییەوە یان کۆمەڵە شوانکارەکانەوە واتە ئەوانەی کە توانییویانە ئاژەڵ و مەرومالات و ولاخ بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە هەنگاوێکی بەرەو پێشتریان ناوە بۆ دروستکردنی سنورێك لەگەڵ کۆمەڵەو پێکهاتە وەحشیو نیمچە وەحشیەکاندا لەم بارەیەوە فردریك ئینجلس دەڵێت: جیابوونەوەی خێڵە شوانکارەکان لە کۆمەڵە بەربەرییەکانی تر دابەشبونێکی تری کۆمەڵایەتی و دیسان دابەشبوونی کاری کۆمەڵایەتیە. واتە بەپێی بۆچوونەکانی ئینجلس قۆناغی

شوانکاری قۆناغێکی پێشکەوتووتری کۆمەڵایەتیە بەڵام داخۆ قۆناغی شوانکاری کوردی چۆن بووبێت؟ دیسان ئەوەش پرسیارێکی بێ وەڵامەو نازانین لەو قۆناغەدا جیاوازی زمان و رەگەز هەبووە، ئەگەر هەشبووبێت هیچ لە بارەی کوردەوە نازانین. بەڵام ئەوە ئاشکرایە کورد لە مێژووی زانراوییەوە یان خەریکی شوانکاری بووە یان بە کشتوکاڵەوە خەریك بووە، دیارە هیچ کام لەم دوو بوارەش لە کوردستاندا نە لە رابردوودا و نە ئێستاش پەرەسەندو نەبوون، واتە کوردستان نە وڵاتێکی کشتوکاڵی باش بووە، نە وڵاتێکیش بووە لەبەر سەختی ئاووهەوا و کەمی ئاوو ناڵەباری لەوەڕگا بۆ ئاژەڵداریش گونجاو بووبێت، بە مانایەکی تر داهاتی ئابوری کوردستان کە لەو دوو سەرچاوەوە کۆبۆتەوە لاواز بووەو نەیتوانیووە ببێتە بنەمایەکی پتەو و بەهێزی بەدیهێنانی رۆحی بزوێنەری پەرەسەندنی بوارەکانی ژیان و هەر لەوێشەوە ئەو داهاتە وەکو ئابوری ببێتە بزوێنەری مێژوو. لێرەشدا شتێکی ترمان بۆ ئاشکرا دەبێت ئەویش ئەوەیە کە تۆپۆگرافیای ناڵەباری کوردستان دەوری سەرەکی بینووە لەوەدا کە ئابوری نەبێتە بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، بە واتایەك تر مانەوەی کۆمەڵگای کوردی لە سنوری پەیوەندییەکانی خێڵایەتیدا، نەتوانینی بەجێهێشتنی ئەو جۆرە سیستەمە کۆمەڵایەتیە بەندە بەلاوازی ئاستی هەردوو بواری شوانکاری و کشتوکاڵەوە لە رابردوودا.

لە مێژووی کۆمەڵایەتی کوردیدا نە قۆناغی شوانکارەیی بە سروشتی خەملاوەو هاتووە تا لەو قۆناغەدا کشتوکاڵیش ببوایەتە سەرچاوەیەکی تری بنیادنانی ئابوری و خێزان و بەو پێیەش ئابوری کۆمەڵگا. هەر لەوێشەوە نیشتەجێ بوون خۆی بسەپاندایەو بنەمای سەرەکی ئابوری لە داهاتی ئاژەڵەوە وەکو تاکە سەرچاوەیەك بگۆڕایە بۆ داهاتی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و ئەمەش هەر لە قۆناغی زووەوە بگەیشتایەتە ئەنجام و لەوێشەوە پەیوەندی ژیانی شوانکارە کە گەوهەرەکەی سنووری پاکژو

پاوەندو پاراستنی ئەو سنوورەیە بگۆڕایە بۆ ژیانی کشتوکاڵی کە گەوهەرەکەی پەیوەستبوونە بە خاکەوە واتە نیشتەجێ بوون و دروستبوونی پەیوەندی مڵکدارێتی زەوی. راستە نیشتەجێبوون لە دێرزەمانەوە لە کوردستاندا دەستی پێکردووە بەڵام لەبەر لاوازی و کەمی زەوی کشتوکاڵی دانیشتوان زیاتر بە ئاژەڵدارییەوە خەریك بوون و کەمتر بواری کشتوکاڵ کردن هەبووە مەگەر بە ناچاری بەشی پێداویستییەکانی ژیان دانەوێڵە کرابێت.. بەشێك لە گەلی کورد لە ژیانی کۆچەرێتیدان، بەشێکی تریان نیمچە کۆچەرین، بەڵام زۆرێکیان نیشتەجێن کە ئەوانیش جوتیارن و زەوییەکی کەم دەچێنن بەڵام پیشەی سەرەکیان پەروەردەکردنی ئاژەڵە(١٥) دیارە ئەم قسەیە باسی قۆناغێکی زۆر درەنگ لە ژیانی کۆمەڵایەتی کوردی دەکات و دەشێ ئەویش قۆناغی سەدەی نۆزدەو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بێت، ئەگینا لە سەردەمی میدەکاندا کە دیارترین قۆناغی ژیانی تۆمارکراوی کوردەو لەو قۆناغەشدا سەرچاوەی سەرەکی ژیان ئاژەڵداری بووە کشتوکاڵ سەرچاوەی دووەم بووە.

لە راستیدا هیچ کام لەو قۆناغە مێژووییانەی کە بە پێی دیالێکتیکی مێژوو هاتوون و تێپەڕبوون لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لە کوردستاندا بەو شێوەیە بەرجەستە نەبوون کە لایەنی کەمی خەسڵەتە کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و ئەخلاقی و ئایدیاییەکانی ئە قۆناغەیان تیا بەرجەستە بووبێت و لەوێشەوە گۆڕان بۆ قۆناغی دواتر بەشێوەیەکی ئاسایی روویدابێت. ئەوەش وەك ئەم لێکۆڵینەوەیە جەختی لەسەر دەکات لەژێر کاریگەری نێگەتیڤی تۆپۆگرافیای کوردستاندا روویداوە.

لەم بارەیەوە شەرەفخانی بەدلیسی دەڵێت: لە هەموو لایەکەوە چیای زۆر بەرز دەور کوردستانی داوە لە بەشە جنوبییەکەی نەبێ کە زۆری بان و هەن و کانیاوی بە تەوژمی تێدان و دەشت و مەزرای زۆریشی هەیە کە بە ئاوی چەم و کانیاوەکان پاراو دەبن(١٦). هەڵبەتە لەلایەك دەوردانی

کوردستان بەو چیا سەختانە ئەگەر ئەو بۆچوونە بەگوێرەی رۆژهەلات و باکور راست بێت بوونەتە هۆی دابڕانی کوردستان لە دەورو پشتی و ئەو چیایانە وەکو لەمپەر سروشتی کوردستانیان لە دەرەوەی خۆی پەرت کردووە کە لە راستیدا دەبوو ئەوە بە بارێکی تردا بشکایەتەوەو ببوایەتە هۆی تەواو پەرتکردنی کوردستان لە ولاتانی دەوروبەری و بواری پێکەوەلکاندنی سیاسی و ئیداریشی بە دەولەتانی دەوروبەریەوە نەدایە، بەلام لە راستیدا چیاکان بەو جۆرەی شەرەفنامە باسی دەکات سنووری کوردستانیان نەداوە یان بە تەواوی نەکەوتوونەتە چێوەی کوردستانەوە. راستە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و تەورۆس وەکو لەمپەری سروشتی بۆ دیاری کردنی سنووری ولاتی کوردان لە رۆژهەلات و باکوری رۆژهەلاتەوە ناودەبرێن بەلام ئەم زنجیرە چیایانە سنور نین بەلکو بەشێکن لە ناوەندی کوردستان.. زنجیرە چیاکانی تەورۆس و زاگرۆس تارادەیەك بڕبڕەی پشتی ئەو ولاتە (کوردستان) پێکدێنن کە بەشێوەیەکی گشتی زەوییەکی بەرزەو مرۆڤ دەتوانێ لە شوێنە بەرزەکانیەوە سەرنجی زەوی چواردەوری خۆی بدات(١٧). لەمەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە ئەم زنجیرە چیایانە لەسەر سنووری کوردستان و دەرەوە نین و وەکو هێلێکی باریکی سنووری بن و کوردستان لە دەرەوەی خۆی پەرت بکەن. هەروەها مارتن ڤان برۆنسن دەلێت: رۆژهەلات یان کوردی تەورۆس و زنجیرەی زاگرۆس بڕبڕەی پشتی کوردستان پێکدێنن کە ئەمیش لە باکوری رۆژئاواوە درێژ دەبنەوە بۆ باشوری رۆژهەلات(١٨). ئەم قسانەش روونی دەکەنەوە کە ئەم زنجیرە چیایانە نەبوونەتە سنووری رۆژهەلات و باکوری کوردستان بەلکو بەشێکی سەرەکی لە ناوەندی کوردستان پێکدێنن و سەختی ئەم چیایانەش بەربەستە لەبەردەم نیشتەجێبوونێکی گونجاودا، بە مانایەکی تر ئەم زنجیرە چیایانە دەولەمەند نین، ئەویش لەژێر دوو هۆکاردا یەکەمیان لەبەر بارینی بەفرێکی زۆر لێیان کە بەشێوەیەکی

گشتی زۆربەی وەرزی زستان دادەپۆشرێن، دووەمیش لەبەر سروشت و جۆری خاکەکەی و پێکهاتنی بەشێکی زۆریشی لە بەردو تاوێرو گلێکی بێ پیت. ئەم دوو زنجیرە چیایەو زۆربەی چیاکانی تریش لە کوردستاندا هەمان ئەو دوو خاسێتەیان هەیەو لە راستیشدا رووبەرێکی فراوانی کوردستان چیا داگیری کردووەو نێو چیاو قەد چیاش بە دەگمەن بۆ نیشتەجێ بوون دەست دەدات، هەر بۆیە لە رووی دیموگرافیەوە ناوچەیەکی زۆری کوردستان کە لە چیاکان پێکهاتوون وەکو چۆڵەوانی وان و بە ناچاری دانیشتوانی کوردستان لەسەر کانی و کارێزەکان و لە دەشتە تەسکەکانی دامێنی ئەو چینادا نیشتەجێ بوون کە ئەوانیش لەبەر تەسکی و کەم مەودایییان جێگای ژمارەیەکی کەمی خەڵکیان تێدا بۆتەوە کە زۆربەی کات تەنانەت تیرەو بنەماڵەکانی خێڵێکیش بە ناچاری دابەشبوون بەسەر چەند ناوچەیەکداو نەیانتوانیوە پێکەوە بژێوی ژیان لەیەك شوێندا بەدەست بهێنن، بەوەش رایەڵەکانی پەیوەندی خوێن و خزمایەتی سست و لاواز بوون و نەك هەر توانای بڵندبوون و یەکگرتنیان لەگەڵ خێڵەکانی تردا نەبووە بەڵکو لە بەشەکانی تری خێڵ و عەشیرەتەکەی خۆیشیان پەرت بوون و بەوەش لەگەڵ بەسەرچوونی کاتداو راهاتن لەگەڵ ئەو جۆرە ژیانەدا کە ژیانی پەرتبوون و پەرەوازەیی بوونە رۆحی لێکتر نزیکبوونەوەو یەکێتی و یەکبوون بەرەو هەرەس و شکست چووە، دیارە لە حاڵەتێکی وەهاشدا بنەماکانی پەرەسەندن و گەشەی کۆمەڵایەتیش شێواوە چونکە لە بنەڕەتەوە ئەو جۆرە دابەشبوون و پەرتبوونە باری کۆمەڵایەتی بوونی کۆمەڵگای کوردی شێواندووە.

زۆری و سروشتی چیاکانی کوردستان و باری سەخت و ئاڵۆزیان و داگیرکردنی رووبەرێکی بەرفراوانی جوگرافیای کوردستان پێیان لە زۆر رووەوە کاری کردۆتە سەر دابەشبونی دانیشتوان و پەرش و بڵاوکردنەوەیان لە یەکترو دوورخستنەوەیان و نزم کردنەوەی رێژەی

تێکەڵاوبوون و لێکتر شارەزا بوون و دروستبوونی بەربەستی رۆحی و سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و مەزهەبیش، لەلایەکی ترەوە ئەو بەربەستە سروشتیانە بوونەتە رێگر لەبەردەم گەشەی ئاستی ژیان و پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان و هۆیەکانی بژێویدا، بە ئەندازەیەکی ئەوتۆ هەر خێزان و بنەماڵەو تیرەو خێڵێك یان عەشیرەتێك هەست بە سەربەخۆیی خۆی بکات و لە سنووری جوگرافیای داخراوی خۆیدا وەك قەوارەیەکی سەربەخۆ لەخۆی بڕوانێت و تەنانەت ئەگەر سنوورو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی لە سنووری کوێرە گوندێکی کوردستانیش تێپەڕی نەکردبێت. ئەو شێوە پەرت و بڵاوییە وەهای کردووە لە مێژووی کورداو بگرە لە مێژووی حیزب و رێکخراوە سیاسییەکان و تەنانەت لە بنیادی دەزگاکانی بەڕێوەبردنیشدا هەمان بنەماکانی دامودەزگای لاوازی خێڵایەتی هەیکەلی ئەو دامودەزگا نوێیانەش پێکبهێنێت و ئەم دامودەزگایانەی کە لە ئێستادا هەم هەمان خاسیێتەکانی دامودەزگای خێڵایەتی لاوازی کوردیان هەیەو هەمان عەقلیەت و هەمان ستراتیژو هەمان شێوازی بەڕێوەبردن بەڕێوەیان دەبات. بۆ نموونە هەیکەلی حیزب و شێوازی پێکهاتنی تاکو ئێستاش لە کوردستاندا هەیکەلی خێڵەو مەگەر بە دەگمەن ئەگینا بەشی هەرە زۆری ئەندامانی سەرەوە لەسەر بنەمای خێڵ و عەشیرەتەکانیان یان هەرێم و ناوچە جوگرافیەکانیان جێگایان پێدراوە، لە دەزگاکانی بەڕێوەبردنیشدا هەمان شێوەیە، ئەگەر سەرنجی جێگا دیارەکانی بەڕێوەبردنی کوردی و حکومەتی کوردی بدەین بەشێوەیەکی گشتی کوڕانی خێڵ و عەشیرەتەکان و ئەوانەی پشتیان لەنێو سەرکردایەتی حیزبەکاندا هەیە کاربەدەستن کە زۆربەی زۆریشیان بێتواناو نەزانن. کەچی حیزبەکانی کوردستان بەم سیاستە خێڵەکیە دواکەوتووەشیانەوە باسی کۆمەڵگای مەدەنی و دەسەڵاتی گەل دەکەن.. ئەگەر لە ئیدارەی کوردستاندا کەسێکی بێ پشت لە ئەنجامی ململانێی نێو سەرکردایەتی حیزبدا هێنرابێتە نێو ئیدارەی حکومەتەوە

ئەوە بێگومان ئەو کەسە نە هیچی بە دەستەو نە خاوەنی بڕیاریشە لە جێگاکەی خۆیدا با زۆر شارەزاش بێت چونکە ئەو پشتی نیە کە پشتیشی نەبێت هیچ کەس گوێی لێناگرێت و کاری بۆ رایی ناکرێت. ئەمەش هەموو جێکەوت و ئاسەواری عەقڵ و ستراتیژو خێڵایەتی ناسروشتی و دواکەوتووی کوردەوارییە کە نەك هەر رابردوومانی کوشتووە بەڵکو بۆتە حاڵەتێکی هەمیشە ئامادە لە ئەستی کۆمەڵایەتی کورداو بیرکردنەوەی کورد بەگشتی مەرداو رەهەندێکی تەسکی هەیەو لە سنووری عەقڵ و ستراتیجی خێڵایەتی تیپەڕناکات و ناگاتە ئاستی عەقڵ و ستراتیجی نەتەوایەتی.

باری شێواو و نائاسایی گەشەو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردی لە کۆنەوە بۆ ئێستا وایکردووە کە جگە لە دامودەزگای لاوازی خێڵایەتی یان شێوە خێڵایەتی هیچ دامودەزگایەکی گەشەسەندوتر دروست نەبێت.

دامودەزگا کۆمەڵایەتی و ئیداری و کەلتوری ئیتنیکیو ئایینی سەرجەم پابەندی تاکە دامودەزگایەکی تری لاواز بن کە ئەویش دامودەزگای لاوازو بێتوانای خێڵایەتیە کە وەك پێشتر گوتمان دامودەزگای خێڵایەتیش بەشێوەیەکی ئیفلیج و ناتەواو لە کوردستاندا دروستبووە. جا هەر کاتێك دەگەڕێینەوە بۆ قسەکردن لەسەر ئاسنامەو پرۆژەو بەرنامەو بنەمای ئازادی و سەربەخۆیی کورد دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ژێرخانی کۆمەڵایەتی کوردی نەیتوانیووە سەرخان وەکو پێویست بەرهەم بهێنێت، بەڵکو سەرخانێکی لاوازی هاوشانی خودی ژێرخانەکە پێکهاتووە ئەگەرچی ئێستا قسە لەسەر نادروستی و نەگونجاندنی ئەو جۆرە لێکدانەوەیە دەکرێت، بۆ خودی زاراوەکانی سەرخان و ژێرخان و پەیوەندی نێوانیان چونکە زۆربەی لێکدانەوە کۆمەڵایەتیەکانی ئێستا ناتوانن بڕوا بەو لێکدانەوە مارکسیە بکەن، بەهەر حاڵ ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە هەرچۆن باری

ئابوری کوردستان لەوپەڕی دواکەوتوویدا بووە بەهەمان شێوە کورد لە رووی عەقڵ و فیکرو تێگەیشتن و پەیبردن و بەرهەم هێنانی فیکریشەوە لەوپەڕی دواکەوتوویدا بووەو ئەم قسەیە بۆ ئێستاش راستە.
لێرەداو لە ئەنجامی نەبوونی سەرخانێکی کۆمەڵایەتی کوردی خاوەن خاسێت و بنەمای نەتەوایەتی دەتوانین بڵێین کورد سەرخانێکی خێڵایەتی دواکەوتووی هەیە، خۆ ئەگەر لە روانگەی نەتەوایەتیشەوە سەیری بکەین ئەوا سەرخانی کۆمەڵایەتی کوردی سەرخانێکی وەهمی یە چونکە هیچ کام لەم رەگەزە پێویستانەی تێدا نیە کە بەبێ بوونیان قسەکردن لەسەر ئایندەو سەربەخۆیی و گەیشتنی کورد بە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت خولاندنەوەیە لە سنوری بازنەیەکی بۆشدا کە وەهم رابەرایەتی و رێنیشاندەرە تێیدا. ئەمەش بەو مانا نیە کە کورد ناتوانێت لە ئێستاو لە ئایندەشدا هیچ بکات، نەخێر بەڵکو کورد پێویستی بە گۆڕانکاری هەیە لە ماهیەتی خۆیدا. کەواتە ئەو گۆڕانکارییە چۆن دەبێت؟
رەنگە لێرەشدا ئەو پرسیارە سەرهەڵبدات ئایا بۆچی لە مێژووی کورددا ئەو بنەمایانەی کە پێویستن بۆ دروستبوونی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان پێکنەهاتوون؟ دیارە ئەم پرسیارەش سەرتاپای مێژووی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی دەگرێتەوە. دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەش راستەوخۆ بەشێوەیەکی گشتی لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە بەربەستی هەمەجۆری تۆپۆگرافی و جوگرافی لە کوردستاندا بەجۆرێك شێوازی سروشتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی شێواندووە کە بنەمای پێکهاتنی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانیش بشێوێنێت. هەر لەم روانگەیەوە ئەو تۆپۆگرافیا نالەبارەی کوردستان هەرچۆن لە قۆناغی ژیانی شوانکاریدا زەمینەی ژیانی ئاژەڵداری خۆش نەکردووە بەهەمان شێوە رێگای دروستبوونی دامەزراوەکانی خێڵیشی بەشێوەیەکی تەواو نەداوە لەو قۆناغەدا کە قۆناغی نیشتەجێ بوون و سەرهەڵدان یان خەریك بوون

بە کشتوکاڵەوە بووە. هەر لەژێر کاریگەری ئەو تۆپۆگرافیایەدا دامودەزگای خێڵایەتی و بەدوای ئەویشدا خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای فیودیالی بەرجەستە نەبوون ئەویش لەبەر ئەوەی لە کوردستاندا زەوی و زارێکی کشتوکاڵی بەرفراوان نەبووەو خەڵك هەرچۆن لە گەرمیان و کوێستاندا بوون بە دوای لەوەڕگاو ئاوو کەش و هەوای لەباردا بۆ پەروەردەکردنی ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتیەکانیان بەهەمان شێوە هەر بنەماڵەو هۆزو تیرەیەك لە دەوری کارێزێك، کانیەك، چەمێك یان لەسەر رووبارو لقەکانی بەمەبەستی دابین کردنی ئاوو خۆراك (ئالف) بۆ مەڕو ماڵاتەکانیان و مسۆگەر کردنی هەندێ زەوی و زارو ئەو ئاوەش کە هەیە بۆ کشتوکاڵ جێگیربوون. لەبەر تەسکی ئەو زەویو زارانەو کەمی ئاو هەرچەند خێزانێك پێکەوە جێگیر بوون. هەندێ جار وا کەوتۆتەوە کە بنەماڵەو هۆزو تیرەکانی خێڵێك بە شێوەیەك پەرەوازەو لێك دابڕاوبن کە ناوچە جیاوازەکانی کوردستانیان گرتۆتەوەو هەر لەوە دەچێت لافاوی تۆفانەکەی نوح عەموو کوردی هەڵگرتبێت و تێکڕا سەرئاو کەوتبن و پاش هەڵمژینی ئاوەکە لەلایەن خاکەوە بە هەڵمبوونیو وشکبوونەوەو شێوەگرتنی تۆپۆگرافیای کوردستان هەر یەکە لەسەر چیایەك، گردێك، لە قەدپاڵ و نشێوێك، لەسەر هەر دەشتۆکەو لەنزیك هەر کانی و کارێزو سەرچاوەیەکدا جێگیر بووبنەوە بەو شێوە پەرت و بڵاوەیە. لێرەوە ئەگەر سەرنجی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد بدەین ئەوا دەبینین کە چۆن بەسەر چەندین ناوچەی لە یەکدوورو پەرەوازەدا دابەشبوون بەجۆرێکی ئەوتۆ کە مەگەر تەنیا لەکاتی مەترسی لەسەر ئەندامانی تری خێڵ و عەشیرەتەکەیان لە جێگاکانی تر هەندێ جار پەیوەندی نێوانیان نوێ بکەنەوەو ئەو یادوەرییە مەعنەویەیان زیندو ببێتەوە. لێرەدا ئەگەر سەرنجی خێڵێکی وەکو (جاف) بدەین دەبینین لە زۆربەی ناوچەکانی باشورو رۆژهەڵاتی کوردستاندا بڵاوبونەتەوە: عەشیرەتی جاف عێلێکی کوردی کۆچەرین، مەیدانی قەڵەمڕەوی ئەم عەشیرەتە لە کفری و شیروانە

تا کەلیخان و دەورووبەری سنەیە(١٩). دیارە ئەوەی مامۆستا سەجادی دەست نیشانی کردووە سنوری گەرمیان و کوێستانی ئەم خێڵەیە، ئەگینا لە نیشتەجێ بوونیشدا ئەم خێڵە بە جوگرافیایەکی لەوە فراوانتریشدا بڵاوبۆتەوە. سەرباری نیشتەجێ بوونیان لە رۆخەکانی رووباری سیروان بە ناوچەکانی شارەزوورو گەرمیان و قەرەداخ و تەنانەت بۆ سنووری دوکان و لە رۆژهەڵاتیش بە رۆخەکانی دوو ئاو واتە سەرچاوەکانی سیروان و تەنانەت هەتا سنوری شاری سنەش ناوبەناو نیشتەجێ بوون. خێڵێکی تری وەکو (باجەلان) ئەوەی ئاشکران لە ناوچەی خانەقین و پشتکۆی لورستان و باشوری موسڵ نیشتەجێ بوون عەشیرەتێکی وەکو بەرزنجی کە سەرباری بنەمای ئاینی و درەختی بنەماڵەکەیان کەواش پێ ناچێت مێژوویەکی هێجگار کۆنیان لە کوردستاندا بەتایبەت پەیوەست بە ناوەکەیان واتە بەرزنجەوە هەبێت. بەڵام بەشێوەیەکی هێجگار بەرفراوان بە پانتایی رووبەری کوردستاندا بڵاوبونەتەوە. عەشیرەتێکی وەك (مەردۆخی) کە ئەمانیش بەپێی درەختی بنەماڵەکەیان سەیدن و دەچنەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام (د.خ). مێژووی دەرکەوتنیان لەسەر وەختی عەباسیەکاندا لە شامەوە دەست پێدەکات و لە سەردەمی سەفەوییەکاندا بەگشتی و لە سەردەمی میرنشینی ئەردەڵاندا بەتایبەتی جێگایەکی دیاریان هەبووە لە سنووری دەسەڵاتی ئاینی ئەم میرنشینەداو دەسەڵاتیان بەسەر لایەنی رۆحیو ئاینی میرنشیندا کردووە، ئەگەرچی ئەم عەشیرەتە لە مێژوویەکی کۆنتردا گەیشتوونەتە ناوچەکانی هەورامان و لەوێوە بۆ ناوچەکانی تری باشوری کوردستان بڵاوبوونەتەوە. هەموو ئەمانە بەڵگەی پەرتبوون و لێك دابڕانی بەشەکانی هەمان خێڵ یان هەمان عەشیرەتی کوردە کە ئەمەش بۆتە هۆی لاوازکردنی رۆحی پەرەسەندن چونکە لەهەموو دابەشبوونێکدا هێزی جوڵە دروستکەر لاواز دەبێت بە ئەندازەیەك کە

ئەگەر ئاستی دابەشبوونەکە زۆر بێت ئەو پێکهاتەیە توانای خۆپاراستنی نامێنێت.

ئەم جۆرە دابەشبوونە لە پێکهاتەی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا هەر لە سەرەتای دەست پێکردنی نیشتەجێبوونەوە هۆیەکی سەرەکی مانەوەی کوردە وەکو کۆمەڵگایەکی سەرەتایی، مەبەستمان لە سەرەتایی بوونیش لێرەدا ئەوە نیە کە هێشتا کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگای دەرەوەی نووسین بێت، بەڵکو مەبەستمان لە سەرەتایی بوونی کۆمەڵگای کوردی مانەوەی ئەم کۆمەڵگایە لە دەرەوەی گەیشتن بە حاڵەت و قۆناغی دروستکردنی دەوڵەت. ئەگەرچی لە رووی نوسینیشەوە تاکو ئێستا کۆمەڵگای کوردی دەشێ وەکو کۆمەڵگای دەرەوەی نووسین لێی بڕوانرێت چونکە تا ئێستاش کۆمەڵگای کوردی لەبری نووسین زیاتر بڕوای بە قسەی شەفەوی و خوتبەدان و کۆڕو کۆبوونەوەی زارەکی هەیە. واتە هێشتا نەبۆتە کۆمەڵگایەکی دۆکیومێنتی و تۆمارکەری پراکتیکی.

پەرش و بڵاوبوونەوەی بەشەکانی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد بەسەر ناوچە پەرەوازەکاندا بەپێی سەرچاوەی ئاوو دەشت و زەوی کشتوکاڵ و لەوەرگا بۆتە هۆی شێواندنی خودی دامەزراوی خێڵ و پەیوەندییە خێلایەتیەکان لەکاتی خۆیداو بەجۆرێك کە خاسیێتەکانی پەیوەندی خوێن و خزمایەتی تووشی تێکچوون و دەرچوون لە باری سروشتی خۆیان هاتوون و مانەوەی سیفاتی خێلایەتی و خوێن لە ئەنجامی ئەو لێکدابرانەدا وەکو سیفەتێکی سەرکوتکراوی لێهاتووەو لەکاتی خۆیدا نەگەیشتۆتە لوتکەو هەتا لەوێشەوە قۆناغی دابەزین بەرەو هەرەس هێنانی دەستی پێ بکردایە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو حاڵەتەی پەرتبوون سیفاتەکانی خێڵی فڕێداوەتە پانتایی نەستی کۆمەڵایەتیەوەو بۆتە بەشێك لە کەسیێتی مرۆڤی کوردو لەکاتی پیادەکردنی دەسەڵات و ئیدارە، لەکاتی خۆنواندن و خۆدەبڕیندا بەگشتی و لەو کاتانەدا کە بوار

بۆ کۆنەستی کۆمەڵایەتی و ئەستی تاکەکەسیش دەکرێتەوە گوزارشت لە خۆی بکات دەگەڕێتەوە بۆ ئەسڵی ماهیەتی خۆیو لەو چرکە ساتەدا کە باسی شارستانێت و کۆمەڵگای مەدەنی و مافی تاکەکەس و دیموکراسی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی دەکات کەچی هەمان شێوەی ئەو باپیرە گەورەی رەفتار دەکات کە لە سنووری خێڵدا رەفتاری کردووە واتە لە ئەنجامی ئەو چەپاندنەدا ئەم رۆحی باپیرانی دەیجوڵێنن و لەژێر رکێفی ئەو رابردووە شێواوو ناسروشتیە دەرباز نابێت. واتە ئەم لەبەرزترین پلەی خۆ بە شارستانی زانینەوە دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی سەرەتای بوونی خۆیی و وەکو خێڵەکیەکی تەواو مامەڵە دەکات و لە دنیا دەڕوانێت.
ئەمەش حاڵەتێکی باوەو مرۆڤی کورد چ وەك تاك و چ وەك کۆمەڵ، چ لە شارداو چ لە لادێدا وەکو گەڕانەوەی مرۆڤی کامڵ بۆ قۆناغی منداڵی، یان وەکو گەڕانەوەی مرۆڤی هەستیارو بێزاری نێو پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی شار بۆ نێو سروشت ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ زیندوکردنەوەی قۆناغی خێڵایەتی کۆمەڵگا چونکە ئەو قۆناغەی بەتەواوی نەبڕیووە هەمان شێوەی هەموو ئەو مرۆڤە گەورە بوانەی کە قۆناغی منداڵییان نەبووە.
ئەمیش قۆناغەکانی ژیانی پێشتری ناتەواو بوون و ئێستا لە کۆنەستی کۆمەڵایەتیدا کە مەبەست کۆنەسەتی کۆمەڵایەتی کوردە ئەو رابردووە ناتەواوە وەکو حەزو ئارەزوو یان وەکو ویستە غەریزی و ئەنتۆلۆژییەکانی چەپێندراوە. بە مانایەکی تر لەبەر ئەوەی کۆمەڵگای کوردی لە قۆناغەکانی منداڵی کۆمەڵگادا نەیتوانیووە سیفاتەکانی خێڵایەتی خۆی دیاری بکات و مومارەسەی هەموو ویست و ئارەزووەکانی ئەو قۆناغە بکات و لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و جوڵەی بەردەوامی کۆمەڵگادا کۆتایی بەو قۆناغە بهێنێت بۆیە سیفاتی خێڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا بۆتە سیفاتێکی بەجێماوو لەرۆحی هەموو کورددا لە هەموو کات و شوێنێکدا ئامادەیەو هەروەها لە خۆرەو

بەبێ باربووکردنەوەی بوونە لەدەست چووەکانی ئەو قۆناغە کۆتایی نایەت.

مانەوەی پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی کە بنەمای خێڵایەتین و لە ئاستی بە سروشتی کارکردن و جوڵاندنیاندا دەشێ بەرەو بڵندبوون بچن و بنەمای بەکگرتنەوەو یەکبوون یان بە وتەیەکی تر بنەمای دروستکردن و پێکهێنانی فیدراسیۆن بخەملێنن، بەڵام مانەوەی ئەم دوو بنەمایە لە ئاستێکی نزم و داخراودا گواستنەوەیان لە حاڵەتی ئاساییەوە بۆ حاڵەتی نیمچە چەپاندن و سەکورتکردن لەژێر کاریگەری سروشت و شێوازی نارێك و نادروستی دابەشبووندا گرێی هەست بە کەمیکردن و هەست بە گۆشەگیری کردنی لای کورد دروست کردووە کە ئەوەش دەوری کاریگەری هەبووە لە شێواندنی بنەماکانی پێکهاتنی دامودەزگاکانی خێڵایەتی کوردیدا بەشێوەیەکی تەواو پێگەیشتوو.

شێواندنی بنەماکانی پەرەسەندن و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی کوردی هەر لە سەرەتاوە مرۆڤی کوردی کردۆتە ئەو مەخلوقەی کە لە رووی نەشونوماکردنەوە لە بارێکی نائاسایدا بێت و نەتوانێت لەو حاڵەتە ئیفلیجیە کۆمەڵایەتیەی دەرباز ببێت و هەستێنە سەرپێ. بێگومان هۆیەکی سەرەکی مانەوەی کورد لە دەرەوەی پەرەسەندندا ئەوە بووە کە هەموو وزەو توانای کورد لە پێناوی بەدەست هێنانی ژیان لەم جوگرافیا سەختەدا بەکارهێنراوەو بە مانایەکی تر ئەگەر ململانێی مرۆڤ بەگشتی لەگەڵ سروشتدا بۆ رکێف کردنی سروشت بووبێت ئەوا ململانێی کورد لەگەڵ سروشتدا بۆ ئەوە بووە سروشت وا لێبکات بواری ژیانی پێ ببەخشێت یان لەناو سروشتدا ژیانی خۆی دابین بکات، چ لە خۆراك و پێداویستییەکانی ژیان چ لە خۆپاراستن و لە مەترسیە سەختەکانی ئەو سروشتە.

هەڵبەت جێگای خۆیەتی ئاماژەش بۆ ئەوە بکرێت کە شوێنی جوگرافی کوردستان لە نێوان شارستانیو دەوڵەت و دەسەڵاتە دیارەکانی

رابـردووی زوودا واتـه لـه سـەردەمی رۆم و فـارس و میزۆپۆتامیـادا هۆیەکی تری شێواندنی باری ئاسایی کۆمەڵگای کوردی بووە چونکە زۆربەی کات کوردستان بۆتە مەیدانی شەڕو پێکدادانی هێزو سوپاکانی ئەو دەوڵەتانەو لە ئاکامیشدا کورد زەرەرمەند بووە، باشترین نموونەش تێپەڕبوونی سوپای (دە) هەزار کەسی یۆنانە لە ساڵی (٤٠١)ی پێش زایندا بە کوردستاندا. کە دیارە لەو رێکردنەدا سوپای یۆنانی بە سەرۆکایەتی گەزنەفۆن وێرانکارییەکی زۆریان لە کوردستاندا کردووە ئەویش لەوەدا دەردەکەوێت کە دوای شەڕکردن و کوژرانی ژمارەیەکی دیار لە سەربازەکانی سوپای گەزنەفۆن لەنێوان گەزنەفۆن و کوردەکاندا ئاگربەستێك دەکرێت کە ناوەرۆکەکەی ئەوەیە: کوردەکان لاشەی کوژراوە یۆنانیەکان بدەنەوە بە مەرجێ یۆنانیەکان شوێن و جێگاکانیان نەسوتێنن(٢٠) ئەم وتەیەش ئەوە ئاشکرا دەکات کە لەو مێژووشدا کە نزیکەی سەدەو نیوێك دوای روخاندنی دەوڵەتی میدە کورد رۆحی بەرگرییان هەر ماوەو سەرباری پەرت و بڵاوی و پەرەوازەیی خێڵایەتی و گەرمیان و کوێستانیش هێشتا جۆرێك لە رۆحی یەککگرتنیان تێدابووە، راستە ئەوەی لەگەڵ سوپاکەی گەزنەفۆندا جەنگاون و رێگایان پێگرتوون سوپایەکی یەککگرتووی بەهێزو رێکخراو نەبووە، بەڵام گومانی ئەوەش ناکرێت کە ئەو جەنگاوەرانەی کورد لە ئەندامانی بنەماڵەو خێڵێك زیاتر بوون چونکە توانیوویانە رێگا بە سوپایەکی گەورە بگرن کە بەپێی سەرچاوە مێژووییەکەی گەزنەفۆن خۆی دە هەزار جەنگاوەر بوون. ئەنجا لە رێکەوتننامەکەی نێوان گەزنەفۆن و کوردەکاندا مەرجی کوردەکان بۆ نەسوتاندنی ماڵ و جێگاکانیان ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات لەلایەك کوردەکان ئەگەر کۆچەریش بووبن لەو کاتەدا جۆرە پەیوەندییەکیان بەخاکەوە هەبووەو ئەو ناوچەیە کە سنووری قەڵەمڕەوی گەرمیان و کوێستانیان بووە بە نیشتمانی خۆیانیان زانیووە بۆیە لە پێناویدا شەڕیان کردووە.

له لایەکی تریشەوە دەردەکەوێت کە سوپاکەی گەزنەفۆن زیانی زۆری لە کورد داوەو ماڵ و حاڵیان سوتاندون کە ئەوەش بەدرێژی نیشتەجێ بوون و سەقامگیربوونی کورد بووەو لەو مێژووە کۆنەشدا ئاسەوارێکی خراپی سەر پانتایی کۆنەستی کورد بەجێهێشتووە کە ئەویش ئەوەیە ئەم دوور لە ویستی خۆی سەرباری مەترسییەکانی سروشت و دیاردە سروشتییەکان لەبەردەم مەترسی لەنێوبردنی خۆی و وێرانکردنی ماڵ و حاڵەکەی و بە تاڵان بردنی سەروەت و سامانەکەیدایە لەلایەن خەڵك و گەل و هێزەکانی دەوروپشتییەوە کە ئەوەش لەوساوە بۆ ئێستا لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کورددا دەژی و تاکو ئێستاش کورد لە رووی دەرونییەوە ناتوانێت هەست بە دڵنیایی و سەقامگیری خۆی بکات ئەویش لە ترسی هێرش و دەست درێژی دەوروپشتەکەی. ئەم هەستکردنەش وایکردووە کە کورد هەر تەنیا بۆ ئێستا بژی و بیر لە داهاتوو نەکاتەوە چونکە وا هەست دەکات داهاتووی لە بەردەم مەترسیدایە، نەبوونی پرۆژەی گرنگی نەتەوەیش بۆ ئاییندە تەنانەت لە ئێستادا کە خاوەنی پرۆژەی داهاتوویی نیەو هیچ بەرنامەیەکی نیە بۆ ئاییندە بەهۆی جێکەوت و ئاسەواری ئەو مەترسیەوەیە کە لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی ئێمەدا جێگیرەو هەمیشە لە بەردەم گومانێکی خنکێنەردا بەرامبەر بە ئاییندە رامان دەگرێت، بنەماکانی دروستبوونی ئەو ترسەی کە ئەو گومانە بەردەوامەی لای ئێمە دروست کردووە دیسانەوە رەگ و ریشەی لە قوڵایی ماهیەت و گەوهەری بوونی ئێمەدایە، ئەویش خوڵقێنەراوو بەرهەم هاتووی ژێر کاریگەری تۆپۆگرافیای کوردستانە.

تۆپۆگرافیای کوردستان رێگای نەداوە سەرجەم بنەماڵەو تیرەکانی خێڵێك یان تێکرای بنەماو لقەکانی عەشیرەتێك لە ناوچەیەکی دیاریکراودا نیشتەجێ بن و هەموو پێویستییەکانی ژیانیاندا لەوێدا دەستگیر ببێت و دەستەبەری بکەن و لە شێوەیەکی سروشتیدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان مەودای سروشتی خۆیان وەربگرن، هەر لە

دروســتکردنی خــێزان و ژن و مێردایــەتی و پــەیوەندی خزمایــەتیو خــاوەندارێتی زەوی زارو پــەیرەوکردنی ئــایین و زمــانی قســەکردن و دەربڕین و جل و بەرگ و ماڵ و خواردن و تێکەڵاوبوون شین و شایی و ســەرجەم داب و نــەریتی کۆمەڵایەتیــیەوە.. لەســەر بنــەمای هــەموو ئەوانــەش دامودەزگــای کۆمەڵایــەتی ئیــداری و ئــابوریو ســـەربازی و ئتنیکیو ئایینی خێڵایەتیش پێکبهاتنایە. بە واتایەکی تر خێڵ خاوەنی هــەموو خەســڵەت و بنــەماو دەزگاکــانی بــەڕێوەبردنی خــۆی بوایــەو بەوپێیەش لەگەڵ گەشەسەندن و بەرەو پێشەوە چووندا ئەویش گۆڕانی بەسەردا بهاتبایەو بـەرەو تێکشـاندن بچوایـەو لـە جێگـایدا دامـەزراوی نوێتر بەپێی قۆناغی مێژوویی پێکبهاتبایە.

دروســت نــەبوون و پێکنــەهاتنی دامــەزراوی خێــڵ لــەو قۆناغــەدا بەکاریگەری ئەو بارە تۆپۆگرافیایەی کوردستان کە ئاماژەمان بۆ کـرد وەکـو خـاڵی یەکـەمین لێی دەڕوانـرێ کــە لــەوێوە شـێواندنی گەشــەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی سەرچاوە دەگرێت. گەشەی سروشتی و پەرەســەندنی سروشــتی پەیوەندیــە کۆمەڵایەتیــەکان و پێکهاتــەی کۆمەڵایەتی قۆناغی خێلایەتی بنیادنەری دامودەزگاو پەیوەندی و عـەقڵ و ستراتیژی خێڵایەتیە بۆ قۆناغێکی دیاری کراو کە دەشێ شێوەیەك لـە دامەزراوی بالاش دروست ببێت لەم قۆناغــەدا کـە ئەمیش دامـەزراوی دەوڵـەتی خێڵــە. لــەنێو بنیــادی پەیوەندیــیەکی خێڵایــەتی کــامڵدا توخمـەکانی بنیادنانی قۆناغێکی بالاتری کۆمەڵایەتی دەخـەملێ، بـاری سروشتی ئەو گەشەکردنە لە وڵاتی میزۆپۆتامیای هاوسێی کوردستاندا کـە لـە رووی جوگــرافی و تۆپۆگرافیــاوە زۆر جیــاوازە لــە کوردســتان، دەوڵەتۆچکەی شار دروست بووە، ئەو وڵاتـە واتـە میزۆپۆتامیـا دابـەش بـوو بــۆ چــەندین قـەوارەی سیاسـی- ئـایینی کـە پێیـان دەگوتــرا دەوڵەتۆچکەی شارو هەریەکەیان بریتی بوو لە مەڵبەندی شـار خۆیـی و دەوروبەری و گوندەکانی لەگەڵ کێڵگەو باخ و بێستان و دارخورمـا.. کـە

ئەمانە دەگەڕانەوە بۆ خواوەندی شارەکە. لەنێو کێڵگەکاندا پاوەندو لەوەڕگا بۆ ئاژەڵ و وڵاغەکان هەبوو(٢١). ئەگەر سەرنج بدەین لەو مانایەی کە لە پشتی ئەم چەند رستەوە وەستاوە ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە لە قۆناغی خێڵایەتی دا لە وڵاتی میزۆپۆتامیادا شار دروستبووە، دروستبوونی شار خۆی لە خۆیدا مانای دروستبوونی سەرەتای قۆناغی پەیوەندی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای شارو گواستنەوە لە پەیوەندی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵیەوە بۆ قۆناغی سەرهەڵدانی پیشەسازی. ئەگەرچی بۆ ئەو مێژووە رەنگە باسکردنی شێوازی بەرهەم هێنان و پەیوەندی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای شار کە مەبەست کۆمەڵگای پیشەسازییە بە تەواوی لە جێگای خۆیدا نەبێت. شار دەلالەتی دروستبوونی عەقڵ و ستراتیژیەتێکی باڵاترە لە قۆناغی لادێو ژیانی خێڵایەتی. خوای شار لە مێژووی کۆنی میزۆپۆتامیادا مانای ئامادەبوون و کارپێکردنی دامەدەزگاو دەستوری ئایینی کە راستەوخۆ دەبەسترانەوە بە دەستوری بەڕێوەبردنەوە، کەواتە لە دەوڵەتۆچکەی شاردا دامودەزگای ئایینی -کۆمەڵایەتی- ئابوری- بەڕێوەبردن هەبووەو هەر ئەوەش رێگا خۆشکەر بووە کە میزۆپۆتامیا ببێتە یەکەم شوێن کە دەستوری تیا لەدایك ببێت.

دیارە ئەو دەوڵەتۆچکانەی شار کە باسمان کردن لە سنووری دەسەڵاتی خێڵێك تێپەڕیان نەکردووەو سەرجەم پەیوەندییەکانی خێڵایەتی و شێوەی بەڕێوەبردنی خێڵ کارو باری ئەو دەوڵەتۆچکانەی شاری بەڕێوەبردووەو پەیوەندییەکانیش لە سەرۆکی خێڵەوە کە بۆتە سەرۆکی دەوڵەتۆچکەکە بۆ خوارەوە ئاراستەکراوە کە بەشی خوارەوە بریتی بووە لە هەژاران و کۆیلەو کرێ گرتەی زەوی، بەڵام لە کوردستاندا لەو مێژووەدا نە شار بەو شێوەو نە دەوڵەتۆچکەی شارو نەبارێکی وەها چەسپاوو سەقامگیر دروست نەبووە. نە سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابوریش لەو قۆناغەدا بە ئاشکرا بەتەواوی پێشکەیشتووە.

کوردستان بەر لە دەرکەوتنی ئایینی ئیسلام ئەگەرچی بەردەوام وەکو بەشێکی جیانەکراوە لەسەر زەمینی ئێرانی سەیری کراوەو ئەو ئەرزەمینەش بە نیشتمانی فارس و کورد یان گەلانی ئێران ناوبراوەو سەرباری روخاندنی دەوڵەتی (مید) وەکو یەکەمین دەوڵەتی کورد بەلام هێشتا کورد وەکو گەلێکی رەسەنی ئێرانی سەیرکراوەو تەنانەت لە سەردەمی ساسانیەکاندا پەیامی ئایینی زەردەشتی وەکو ئایینی دێرینەی کوردو گەلانی ئێرانی یان ئاریایی رۆژهەلات کراوەتە ئایینی رەسمی دەوڵەتی ساسانی. لەو قۆناغەدا ناسنامەی ئێرانی بوون بالادەست تر بووە لە ناسنامەی کوردی بون یان فارسی بوون، کوردستانیش لە مێژووی بەر لە دەرکەوتنی ئیسلامدا بەچەند دەوڵەت و شارستانێتی یەکی خاوەن ناسنامە سنووردرا بوو وەکو شارستانێتی میزۆپۆتامیاو گریکی و رۆمی و دەوڵەتەکانی ئەکەدی و سۆمەری و بابلی و ئاشوری و ساسانی. فەرمانڕەوایی کۆنی ئەخمانیشتنی و ساسانی ئەگەر لەگەڵ هەندێك لە سەدەلاتەکانی تری دەورووبەری کوردستاندا هاوکاتیش نەبووبن بەلام نکوڵی ئەوە ناکرێت کە سەرجەم کاریگەری نێگەتیڤیان لەسەر کوردستان هەبووە وەکو پانتاییەکی جوگرافی فراوانی بێ ناسنامەو بێخاوەن لە رووی ئیداریو سیاسی و کەلتوری و شارستانیەوە سەیریان کردووە. ئەوەش وەهای کردووە کە لە سنوورە نزیکەکانی ئەو دەوڵەتانەوە هەندێ باری لێکچووی ئەوانی دەوروبەری لە رووی نیشتەجێ بوون و کاری بەڕێوەبردنەوە دروست ببێت، بەلام هەرگیز ئەوە نەك هەر نەبۆتە حاڵەتێکی گشتی لە کوردستاندا بەڵکو لە قۆناغی بنەماڵەو هۆزو تیرەو خێڵەکاندا دامەزراوی خێڵ بە لاوازی و لە سنوری کۆچ و رەوی بەردەوام و گەرمیان و کوێستان و کشتوکاڵی وەرزی و نیشتەجێبوونێکی بەرێژە کەمدا ماوەتەوەو نەیتوانیووە بگاتە قۆناغی تەواوەتی نیشتەجێ بون و

بەتــەواوی دەســت بکاتــە کشــتوکاڵ و پێداویســتی‌یەکانی ژیــانی کۆمەڵایەتی ئەو قۆناغە بەتەواوی بەرهەم بهێنێت.
ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرنجدانی سروشـتی جوگرافیـای کوردسـتان سەرباری ئـەوەی لـە چـەند لایـەکی سنوریەوە وەکـو بـاکورو بەشـێکی رۆژهەڵات چیای سەخت و بەرز هەن، بەڵام تێکڕا لە رووی بەراوردکردنی نـاوەندو سـنورەکانەوە، دەردەکـەوێت لـە سـنوورەکانەوە بـەرەو دەرەوە ئاستی تۆپۆگرافیا لە بەرزو سەخت و ئالۆزەوە بەرەو دەشت و بان زەوی ئاسایی دەچێت، بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی نێوان هـەردوو (زێ) بدەین، دوا چیـای دیـار لـە نێوانیـاندا چیـای هەیبەتسـوڵتانە دەکەوێتـە پشـتی کۆیەوەو وەکو هێڵێکی راست لە سنووری ئەم (زێ)وە بۆ سنووری ئەو (زێ) دەکشێت و لـە خـوار ئـەم چیایـەوە جگـە لـە بـان و گـردو تەپۆڵکـەو پاشـان دەشتی تاراُدەیـەك فـراوان هیچـی تـر نـابینین، ئەگـەر سـەرنجی باشـوری رۆژئـاوای سـلێمانی بدەیـن کـە ئاراسـتەی بـەرەو کـەرکوك و لەوێشـەوە بـەرەو عـێراقی عـەرەب دەگرێتـەوە زنجـیرە چیـای بـەرانان و سەگرمە دێت و لە دوای ئەویش بانەکانی گەرمیان و گردو بەرزاییەکانی حەوزی چەمچـەماڵ و شوان دێت و سـەرباری کـەمی ئـاو لـەم ناوچانـەدا بـەڵام دەشــت دەســت پێدەکـات و زیـاتر وەکـو ناوچـەی کشــتوکاڵی بەتایبەتی کشتوکاڵی دێمی دەردەکەوێت. هەروەها روبارو چەم و شیوو کانیـاو کارێزەکـان ئاسـانتر بـۆ ئـاودێری و کشـتوکاڵ و بگـرە بـۆ ئـاودانی مەڕو مـاڵاتیش بەکاردێن. ئـەم ناوچانـە بـە ئاراسـتەی سنورەکان بەسـەر پانتاییـەکی بـەرفراوانتردا دەکرێنـەوە کـە دەشـێ خـەڵکێکی زیـاتر لـە ناوچەیـەکی لـەو جـۆرەدا بژیـن. بـۆ نموونـە ئەگـەر سـەرنجی شـارە گـەورەکانی کوردسـتان بدەیـن وەکـو پێشـتریش ئاماژەمـان بـۆ کـرد بـە رێژەیەکی بەرز لە نزیك سنورەکانەوە دروست بوون بۆ نموونـە: هـەولێر، موسڵ، کـەرکوك، خانـەقین. نزیـك هێڵـی سـنووری نێـوان کوردسـتان و عێراقن، کرماشـان و سـنەو مـهاباد دەکەونـە نزیـك هێڵـەکانی سـنووری

نێوان رۆژهەڵاتی کوردستان و وڵاتی فارسەوە، هەروەك لە باکوریش زۆربەی شارە گەورەکانی وەکو ماردین و دیاربەکرو ئۆرفەو وان و نەسیبێن دەکەونە نزیك سنورەکانی وڵاتی تورکەوەو لە ناوەندی کوردستان دوورن. دیارە هۆی دروستبوونی شارەکانی کوردستان نزیك ئەو سنورانە لەژێر کاریگەری چەند فاکتەرێکدا بووە کە گرنگترینیان کەمبوونەوەی چیاکانە بە تایبەتی لە هەردوو سنووری باشوورو رۆژهەڵاتدا. هەڵبەت کەمبوونەوەی چیاکان مانای گۆڕانی باری تۆپۆگرافی یەو زیادبوونی دەشتەکانی لێ دەکەوێتەوە واتە زیادبوونی زەوی لەبار بۆ کشتوکاڵ. ئەم هۆکارانەش یارمەتی نیشتەجێبوونیان داوە، جگە لەمانەش نزیکی ئەم سنوورانە لە پاشماوەی شارستانی کۆنی میزۆپۆتامیاو شارستانی کۆنی ئێرانی رێگا خۆشکەر بووە بۆ ئەوەی بەکاریگەری ئەو هاوسێیەتیە بنەمای کەلتورو شارستانی ئەوان بگاتە سنوورە نزیکەکانی کوردستان لە کاتێکدا ئەو سنوورانە لەچاو ناوەندی کوردستاندا زیاتر بۆ ئەو مەبەستە ئامادەیی تێدابووەو زەمینەیەکی لەبارتر بووە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشداو لەگەڵ دروستبوونی هەندێ شاری کۆن لە هێڵە سنوورییەکاندا وەکو هەولێرو نەینەوا.. هێشتا پەیوەندییەکان لە سنووری هەرە دواکەوتوتووی خێڵایەتی ماونەتەوەو دامەزراوی خێڵ تەنانەت دامەزراوێکی هێندە گەشەسەندو نەبووە کە بنەمای دامودەزگای شاری لەم جۆرەی (دەوڵەتۆچکەکانی شار)ی تیادا دروست ببێت. ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو دانیشتوانەی کە لەم شارانەی کوردستاندا نیشتەجێ بوون. پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی لە ئاستی پەیوەندی شاردا لە نێوانیاندا دروست نەبووەو لەژێر کاریگەری دروست بوون و میکانیزمی ناوکۆیی جوڵەی بەرەو دروستبوونی کۆمەڵگای بۆرژوازی لەو هەناوی کۆمەڵگایەکی فیودیالی- خێڵایەتیەوە شار پەیدا نەبووەو هەتا لە شاریشدا دامودەزگای ئیداری- ئابووری- کۆمەڵایەتی- ئایینی لە

ئاستێکی ئەوتۆدا بووبێت کە هەر کەسێکی هاتوو بۆ سنووری شار بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو بەپێ ی دەستووری دانراوی ئەو دامودەزگا کۆمەڵایەتیە هەرکەس لێ ی بڕوانرێت و مامەڵە بکرێت و لە خاڵیکدا سنوری پەیوەندی و عەقڵیەت و هۆش و ئەستی تاکرەویی و مل نەدان بۆ پیادەکردنی ئەو یاساو دەستورانە بەلاوە بنرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە کە شار دروست بوو لە کوردستاندا هەر ئەوە بووە ژمارەیەکی زیاتر لە خەڵك پێکەوە ژیاون لە پانتاییەکی جوگرافی دیاری کراودا ئەویش لەبەر لەباربوونی جێگای شارەکان بۆ دابین کردنی هۆیەکانی ژیان لە چاو نێوەندی چیاکان و ئاراستەی بەرەو ناوەندی کوردستان. ئەگینا لە رووی دابەش بوونی شاوڵی و ئاسۆیشەوە هەر هەمان پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پەرت بووی نێوان چیاکان و ئاراستەی بەرەو ناوەندی کردستان. ئەگینا لە رووی دابەش بوونی شاوڵی‌و ئاسۆیشەوە هەر هەمان پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پەرت بووەی نێوان چیاکانی کوردستان و هەر هەمان هۆزو تیرەو خێڵە کۆچەرییەکان و لە رووی چینایەتیشەوە دەوڵەمەندو نەجیب زادەو بەگ و ئاغاو شێخ و مسکێن و گرێگرتەی زەوی‌و کۆیلەش لەو پانتاییە جوگرافیەدا جێگیر بوون کە پێ ی گوتراوە شار بە بێ ئەوەی ئایدۆلۆژیاو فیکرو فەلسەفەو ئەخلاقی چینی بالای شار وەکو چینێکی پێگەیشتوی خاوەن سیماو خاسێت کە دەسەلاتی بەڕێوەبردنی بەدەستەوە بووبێت هەبووبێت، بەڵکو ئایدیۆلۆژیاو فیکرو فەلسەفەو ئەخلاق و عەقڵ و ستراتیژی خێلایەتی پەرتبووی نێو چیاکانی کوردستان کە بەرهەمی ژیانی کۆچەرێتی و گەرمیان و کوێستان و پاراستنی پاکژو لەوەرگاو پاوەندکردنی رێگاوبان و ناوچەو کانی‌و کارێز بووە، لەنێو شارەکاندا بالادەست بووەو کاری کردووە. جگە لەوە هەر کەسێك لە شاردا لەبەر نەبوونی وجودی تاکانەی خۆی، یان راستتر بلێین لەبەر رەچاونەکردنی توانا و لێهاتوویی تاکەکەس لە کۆمەڵگایەکی لەم جۆرەداو سەیرکردنی

تاکەکەس لە روانگەی بونی پاڵپشتی خێڵ و عەشیرەتەوە، ئاشکرا ئەوە دەسەلمێنێت کە پەیوەندییەکانی شار پێنەگەیشتون چونکە لە کۆمەڵگای شاردا تواناو لێهاتوویی تاکەکەس دەکرێت بە سەنگی پێوانەکردن نەك بوونی پشتی دامەزراوەکانی وەکو خێڵ و عەشیرەتی بە نفوز.

لەبەر ئەوەی پاراستنی بنەمای پەیوەندی خوێن و دەمارگیری وەکو توخمی سەرەکی پێکهێنانی کۆمەڵگەی خێلایەتی و دواکەوتووی وەکو کۆمەڵگای کوردی دیاردەیەکی ئاشکرای ژیانی کۆمەلایەتی بووە لە شاری کوردستانداو بۆتە بەشێك لە کەلتوری شار. پەیوەندی خوێن لە میانەی سەرخانێکەوە خۆی دەردەخات کە کەلتوری خێل پێکدێنێ، لەبەر ئەوە هەر دژایەتی کردنێکی ئەو کەلتورە، تاکەکەس لە پێکهاتەی دەستەجەمی دەکاتەوەو فڕێی دەداتە بۆشاییەوەو دەیکاتە کەسێکی بێ بنەماو بێ مێژوو(٢٣). کە لە رووی راستیەوە پێویستە پەیوەندی کۆمەلایەتی شار پەیوەندی خوێن و دەمارگیری تێکبشکێنێ و پەیوەندییەکانی کۆمەڵگای شار جێگای پەیوەندی خوێن و خزمایەتی بگرێتەوە، بەلام لە کوردستاندا دروستبوونی شار نەیتوانیووە کەلتوری خێل تێکبشکێنێو بگرە هەمان شێوە ژیانی گوندو گەرمیان و کوێستان و ئەو کەلتورو عەقلیەتە لە شارەکانیشدا ئامادەبوونی هەبووەو تاکو ساتەوەختی ئێستاش ئامادەیەو بۆتە بەشێك لە پێکهاتەی کۆنەستی مرۆڤی کورد. ئەوەش بنەمای دروستبوونی عەقل و ستراتیژی شاخە لە نێوەندە شارداو هۆی هێشتنەوەی کوردە لە قۆناغی بەر لە هاتنە نێو مێژوودا. دیارە وەکو پێشتر لێی دواین سروشتی تۆپۆگرافیای کوردستان هۆکاری سەرەکیە لە دروستکردنی ئەم بارەی پێکهاتنی کۆمەڵگای کوردیدا. لەم بارەیەوە دکتۆر فوئاد حەمە خورشید دەڵێت: باری ژێواری سروشتی کوردستان بە چیا رووتەکانی و رێگا سەخت و دەگمەنەکانی و باری ئاوو هەوای ناڵەباری بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا،

کاریگەرییەکی ئاشکرای لە پەرتکردنی خێڵە کوردەکان لە یەکتری هەبووە بەتایبەتی لە چاخە دێرین و ناوەندەکاندا، بە جۆرێک لەو کاتانەداو بەشێوەیەکی لەبەرچاو هۆی پەیوەندی فیکری و رۆشنبیری و تێکەڵاوبوونی مرۆڤیش نەبووە(٣٠). نەبوونی پەیوەندی و کەمی تێکەڵاوبوون نەك هەر پەیوەندییە سروشتییە کۆمەڵایەتییەکان کە دەرئەنجامی کۆمەڵایەتی بوون سروشتێ لاواز کردووە بەڵکو کاری لە ئاستی عەقڵی و فیکری و ئەخلاقیش کردووەو رێگریش بووە لە بەردەم دروستبوونی رۆحی یەکبوون و یەکێتی خێڵەکانداو لە ریشەوە یەکێتی و یەکبوونی نەتەوەی لاوازکردووە، واتە کۆمەڵایەتی بوونی کوردی بەکاریگەری تۆپۆگرافیای کوردستان لەسەر سروشتی دیموگرافی و دابەشبوونی دیموگرافی کۆمەڵایەتی بوونێکی ناسروشتی و لاواز و داخراو بووەو لە سنورێکی تەسکدا ماوەتەوەو ئەوەش گیانی هەرێمگیری و پاوەندخوازی و تاکرەوێتی و تەنیا خۆبینێ و دان بە خۆدانان و رەتکردنەوەی ئەوانی تری خوڵقاندووە.

هەڵبەتە کاتێ گەشەی کۆمەڵایەتی بەو ئەندازە نەبووبێت کە یاساو دەستوور لەنێوەندی دامودەزگای کۆمەڵایەتییەوە بخەمڵێنێ و بنەمای بەرێوەبردنی شار دابنێت و تاکە یاسایەکی گشتی کاری شار لە رووی کۆمەڵایەتی و دەستوورییەوە بەرێ بکات، ئەوە هەر سەرۆکی بنەماڵەو هۆزو تیرەیەك یان هەر خێڵێك و عەشیرەتێك هەمان شێوەی پەرەوازە نێو چیاکان و لەسەر کانیاوو کارێزو دەشتۆکەکان یاساو دەستووررو داب و نەریتی خۆی پراکتیك کردووە، کە تەنانەت تاکو ئێستاش لە نێوەندی شارەکانی کوردستاندا ئەوە مەسەلەیەکە زۆربەی بنەماڵەو هۆزو تیرەکان پێرەوی دەکەن. بۆ نموونە هەر چۆن پێشتر هیچ خێڵێك رازی نەبووە کچێکی شوو بکاتە کوڕی خێڵێکی تر بەتایبەتی شێخ و سەیدەکان واتە ئەوانەی بەپێی ئەو درەختی بنەماڵەیەی بۆ خۆیان دروست کردووە دەچنەوە سەر پێغەمبەر (د.خ) و کەس و کاری بەوەش لەرووی

مەعنەوییەوە بەشێك لە کوردێتی خۆیانیان بەلاوە ناوە هەر هیچ نەبێت لە رووی رەگەزەوە.

ئەو دیاردەیەی کچ بە شوودان و ژن هێنان تاکو ئێستاش تەنانەت لە شارێکی وەکو سلێمانیدا کە نوێترین و لە رووی کۆمەلایەتی و ئاستی پێشکەوتنیشەوە لە ریزی پێشەوەی شارەکانی کوردستانە کەچی ئەو دیاردەیە بەرێژەیەکی هێجگار بەربلاو ماوەتەوەو ژن و ژن خوازی لە سنورێکی داخراودایە لەنێو ئەو عەشیرەت و بنەمالانەو بە ئاسانی رازی نابن کچەکانیان شوو بکات بە هەر کەسێك حەزیان لێ بێت، بەڵکو پایەی بنەماڵەو نەسەب و پشتی کۆمەلایەتی حساب دەکرێن لەو بوارەدا، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە شار لە کوردستاندا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان و داب و نەریتی ژیانی خێلایەتی لادێ هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵکو ئەو داب و نەریتانە لە شاریشدا وەکو خۆیان ماونەتەوەو سیمایەکی پڕ بەهاترو پیرۆزیشیان وەرگرتووە چونکە لەنێو ژیانی شاردا خێڵ و عەشیرەتەکان ئەو داب و نەریت و عەقڵیەتە بە بنەمای مانەوەی خۆیان و پارێزەری ناسنامەی خێلایەتی و عەشیرەتایەتی خۆیان دەزانن کە دەشێ ئەو ناسنامەیان لەناو شارو تێکەلاوبوونی ئەوانی تردا بۆ بپارێزێت.

لە لایەکی تریشەوە کوردستان لە مێژووی دێریندا تاکە پێرەوێکی ئایینی تیا جێگیر نەبووە هەتا ببێتە بنەمای دەستوورو شەریعەتی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا. هەروەها وەکو یۆنانی کۆن یان میزۆپۆتامیا ژمارەیەك خواوەندی نەبووەو هەر خواوەندێکیش بەرپرسی بوارێکی تایبەتی بووبێت و بۆ هەموو کوردستانیش سەرۆکی خواکان ناسراو بێت و جۆرێك لە مل دان و پێڕەوی کردنی ئەو خواوەندەش لەلایەن هەموو کوردەوە رێگای بۆ جۆرێك لە یەکبوون و کۆمەلایەتی بوون خۆش بکردایەو لەو کۆبوونەوەو یەکبوونەش جۆرێك لە دەستووری کۆمەلایەتی یەکگرتوو بۆ بەڕێوەبردن بەرهەم بهاتبایە. لە سەردەمی بابلی‌یەکاندا هەر

شارەو هەر بوارێکی تایبەتی ژیان و هەر خێڵەش خواوەندی تایبەتی خۆیان هەبوو کە ئەوەش بۆتە هۆی بەرهەم هێنانی دەستورێکی ئیتنیکی- ئاینی و ئەو دەستوورەش بۆتە ئامرازو هۆی بەڕێوەبردن و لەرووبەکی ترەوە لە کوردستاندا دەستورێکی ئەوتۆ پێکنەهاتووە بەجۆرێك کە ببێت بە دامودەزگای کۆمەڵایەتی لەو قۆناغەدا کە ئەوەش زەمینە خۆشکەر بێت بۆ زیاتر جێگیرکردنی بنەماکانی کۆمەڵگای خێڵایەتی کوردی و پێگەیشتنی سیفات و خەسڵەتەکانی لە رووی کۆمەڵایەتی و مێژوویەوە، لەگەڵ دەرکەوتنی ئایینە ئاسمانیەکانیشدا هەر لە ساتەوەختی هاتنە خوارەوەی یەکەم پەیامی ئاسمانیەوە دیسان کوردستان نەبۆتە مەنزڵگای تاکە ئایینێك یان ئایینێك لە کوردستاندا نەهاتۆتە خوارەوە هەتا بنەمای شەرع و دەستووری ئەو ئایینە کاری پێ بکرایە، بەڵکو بە پێچەوانەوە چەندین ئایین و ئایینزاو ڕێبازی ئایینی و تەریقەتی تەسەوف لە کوردستاندا جێگای خۆیان کردۆتەوە چ بەر لە دەرکەوتنی ئایینی ئیسلام چ دوای دەرکەوتنی پەیامی ئیسلامش. پێش ئیسلام لە کوردستاندا ئایینەکانی مانی و زەردەشتی و جولەکەو فەلەو دوای دەرکەوتنی ئیسلامیش سەرباری مانەوەی پەیڕەوکەرانی ئەو ئایینانەی پێشتر، سەرجەم مەزهەبەکانی ئیسلام گەیشتوونەتە کوردستان بەتایبەتی سونەو شیعە. ئەمە جگە لەوەی پەیام هەڵگرانی یەزیدی، و عەلی ئیلاهی و کاکەیی و حەقەو.. لەوساوە تاکو ئێستاش ماونەتەوەو پارێزگاریان لە پەیامی ئایینی خۆیان کردووە. لەگەڵ فەتحی ئیسلامیدا کە ئایینی ئیسلام بەو ڕێگایە گەیشتە کوردستان و خۆی سەپاند، لەگەڵ هاتنیدا دەستوورو پرنسیپی بەڕێوەبردنی خۆیی هێناوەو بنەماو پەرت و بڵاو و کۆنەبووەو نەگەیشتوو بە شێوازی تاکە دامەزراوێکی ئایینی چەسپاوی ئەو ئایینانەی تری ڕووبەڕووی مەترسی کردەوەو بەرەو هەڵوەشاندنەوەی بردن و خۆی جێگای گرتنەوە کە ئەو دەستوورو پرنسیپەش کە دەستوورو پرنسیپی دامودەزگای

ئایینی (تازەهاتوو) بوو بۆ زەمینەیەکی جیاواز لەو زەمینەی کە تیایدا لەدایك بوو واتە بۆ کوردستان کە ئەم پێشتر خاوەنی تایبەتمەندی خۆی بوو مەرج نیە ئەو تایبەتمەندییە لەگەڵ دەستووری تازەهاتووی بەرهەمی عەقڵێکی جیاوازی دەرەوەی زەمینەی کوردستان خۆیدا گونجابێت و رێك کەوتبێت. هەرچەند گوتاری ئیسلام لە گەوهەردا خاسێتی گوتارێکی نێونەتەوەیی هەبووەو دەشیا بۆ هەموو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی یەك روانین و لێکدانەوەو کارپێکردنی هەبووایە، بەڵام بوونی بە بەرنامەو ئایدیۆلۆژیای ئیدارەی دەوڵەتی عەرەبی لە سەردەمی فەتحەوە ئەو حاڵەتی نێونەتەوەیی بوونەی لاواز کردووەو وەکو ئایدیۆلۆژیاو گوتاری دەوڵەتی عەرەبی خۆی نیشانداوە کە ئەو دەوڵەتەش لەو قۆناغەدا ئیسلامی کردووە بە رێگای خۆ بۆ ئامانجی دەستگرتن و داگیرکردنی وڵاتانی تر بە کوردستانیشەوە، بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەش دەتوانین بڵێین دەشیا ئیسلام وەکو پەیامێکی ئاسمانی بە ئاشتی لە هەموو دنیادا بڵاوببوایەتەوەو پەیڕەو بکرایە.

پەیامی ئیسلام کە لە دوورگەی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە بە زمانی عەرەبی و لەسەر خاکی عەرەب و بۆ پێغەمبەرێکی عەرەبی زۆر پەیوەستبووە بە ژیانیواقیعی عەرەبەوە لەو سەردەمەدا بەجۆرێك دەتوانین بڵێین بەر لە هەموو شتێ ئەم پەیامە بۆ رزگارکردنی عەرەبی نیمچە دورگەی عەرەبی هاتووەتە خوارەوە لە نەزانین و دورخستنەوەیان لە خراپەکاریو کاری نامرۆڤانە. هەروەها بەرنامەی یەکگرتنەوەی سیستەمی خێڵایەتی پەرش و بڵاوی خێڵایەتی (بەدو)ی عەرەب بووەو ئامانج رزگارکردنی عەرە بووە لە ژیانی نەزانی و لە بنەڕەتدا بەرنامەی رێکخستنی سیستەمی کۆمەڵایەتی بیابان بووەو بەجۆرێك دەتوانرێت بگوترێت دامودەزوگای دەستوری ئیسلام زیاتر بۆتە دامودەزوگای خێڵایەتی عەرەبی و لەوێوە ماکی یەکگرتن (توحید)ی رشتووە بە مەبەستی رزگارکردنی ئەو کۆمەڵگایە لە پەرت و بڵاوی و پارچە

پارچەیی کە خودی کۆمەڵگای عەرەبی خاوەنی بنەماو مێژوویەکی جیاوازە لە کۆمەڵگای کوردەواری و رەنگە پیادەکردنی ئەو بنەما دەستوریانە لە کوردستاندا نامۆو غەریب بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی کوردی خۆی بنوێنێت و بە ئاسانی ئەو دەستورانە نەکرێتە بنەمای بەڕێوەبردن چونکە لە راستیدا دەبێ دەستوورو یاساکانی بەڕێوەبردن لە زەمینەی واقیعی کۆمەڵایەتیەوە هەڵبهێنجرێن نەك لە دەرەوەی کۆمەڵگاوە بهێنرێن. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە دەستوورو نەریتەکانی ئیسلام ناتەواو بن یان نادروست بن نەخێر بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە هەر زەمینەو واقیعێکی کۆمەڵایەتی دەستوری تایبەتی خۆیی دەوێت. دەتوانین بە بەڵگەی زیندوش بیسەلمێنین کە سەرباری پەیوەستبوونی توندی کوردەواری بە ئیسلامەوە. بەڵام تاکو ئێستاش داب و نەریتە کۆمەڵایەتیەکانی کوردەواری لە پیادەکردندا دەخرێنە پێش بنەماکانی شەرع و دەستووری ئیسلامیەوە.

هەرچۆن سروشتی جوگرافی و تۆپۆگرافی کوردستان دەوری هەبووە لە دابەشبوونی دانیشتوان و پەرت و بڵاوکردنەوەی بنەماڵەو هۆزو تیرەو خێڵەکان و مل نەدانیاندا بۆ پیادەکردنی یاساو دەستورێکی گشتی بەسەر هەموویاندا و لە بنەڕەتیشەوە فۆرمەلە نەبوونی یاساو دەستوورێکی لەو جۆرە بەهەمان شێوە باری تێکەڵ و پێکەڵ بوونی چەندین ئایین و مەزهەب و رێباز هاوکات لە کوردستاندا دەوری کاریگەری هەبووە لە رێگەنەدان بە دروستبوونی تاکە کەلتورێکی ئیتنیکی- ئایینی لە کوردستاندا کە ببوایەتە ماك و بنەمای دروستبوونی دامەودەزگاو دەستوور.

ئێمە تاکو ئێستا لەسەر دامودەزگا Institution زۆر وەستاین و سەرجەمی گرنگی دانیشمان بە دامودەزگای کۆمەڵایەتی- ئابوری- سیاسی- ئیتنیکی- ئایینی- بەڕێوەبردن لەو روانگەیەوەیە کە وەکو پێویست دەبێ پێکهاتنی کۆمەڵگا لە رووی میکانیزمی پەیوەندیە

ناوكۆییەكانیەوە ئەو دامودەزگایانە پێكبهێنێت كە سیفەتی سەرەتایی و لەهەمان كاتدا سەرەكین بۆ سەلماندنی كۆمەڵگا ئیتر گرنگ نیە كۆمەڵگا لە كام قۆناغی ژیانی كۆمەلایەتی خۆیدایە، بەڵكو ئەوەی گرنگە بۆ ئامادەبوونی كۆمەڵگا لە رووی زەمینە خۆشكردنەوە بۆ خۆ سەلماندن دروستبوونی دامودەزگا كۆمەلایەتیەكانە كە زەمینەی كاری بەڕێوەبردنی كۆمەڵگا لە شێوەیەكی رێك و پێكی دیسپلین كراودا ئامادە دەكات و هەر لەسەر بنەمای دروستبوونی ئەو دامودەزگایانەش كۆمەڵگا لە شێوازی پەیوەندی نێو سروشتەوە دەگوازرێتەوە بۆ پەیوەندی (شار).

دیارە ناكرێت كاریگەری ئەو بارە نالەبارەی تۆپۆگرافیای كوردستان لەسەر گەشەی كۆمەلایەتی و شێواندنی و دواخستنی پشت گوێ بخەین چونكە ئەوەش فاكتەرێكی هاوكارە لەگەڵ جوگرافیای كوردستانداو هەردووكیان كاریگەری نێگەتیڤیان هەبووە. لەم بارەیەوە بەدلیسی دەڵێت: كوردستان بە لوڕستانیشەوە بەشی زۆری رەقەنەو چڕو لێڕەوارەو نەرمانی ئەوەندە نیە كە بەرهەم و درامەتی كشتوكاڵی دانیشتوان هەموو بە تەسەل تێر بكا. سەبارەت بە رژدو كاڵی زەوی و زارەكانی كورد لە چاو دەرودراوسێكانیان هەژارو نەدارن(٢٤). لێرەدا رووبەڕووی دوو بۆچوونی گرنگ دەبینەوە. یەكەمیان زەوی كوردستان كەمتر بۆ كشتوكاڵ دەست دەدات، بە واتا بەو شێوە سروشتی‌یەی هەیە نابێتە زەمینەیەكی لەبار بۆ نیشتەجێ بوون كە نیشتەجێ بوون راستەوخۆ لەگەشەی كشتوكاڵەوە دەست پێدەكات و بەبێ زەوی كشتوكاڵی دروستبوونی گوندو پاشتریش شار كارێكی نەشیاو بووە. لە بەرامبەر لاوازی جوگرافیای كوردستاندا لە رووی زەوی و زاری كشتوكاڵیەوە زەوییەكەی رەقەو چڕەو تا رادەیەك جێگای پەروەردەكردنی ئاژەڵە چونكە پاكژو لەوەڕگای زۆرە. ئەمەش رێگا خۆشكەرە بۆ برەودان بە ئاژەڵداری و رۆیشتن و گەڕان بەدوای پاكژو ئاودا. واتە گەرمیان و كوێستان كردن كە ئەوەش وەهای كردووە هۆزو

تیرەو خێڵەکانی تر دابڕاوبن و ژن و ژن خوازی تەنیا لە سنووری داخراوی خۆیاندا قەتیس بکرێت، ئەوەش لە رووی بایۆلۆژییەوەو لەسەر بنەمای تیۆری (بۆماوە) گەلێك کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم گەشەکردندا دروست دەکات. لە باری کۆمەلایەتییەوە زیاتر پەیوەندیەکانی خوێن و دەمارگیری خەستترو چڕترو گرژتر دەکات لە جیاتی ئەوەی ئەو پەیوەندییانە بگوازرێتەوە بۆ ئاستیبڵندبوون بەڵکو دووچاری لادانیان دەکات بەلای تەنگەنەفەسی و کورت بینی و شەڕەنگێزیدا. کە ئەوەش تاکو ساتەوەختی ئێستا بۆتە سیفەتێکی پارێزراو لە کەسێتی تاکەکەس و کۆمەلایەتی کورددا. دیسان ئەو شێوە ژیانە بواری دروستبوونی هیچ جۆرە دامودەزگایەکی خزمەتگوزاری نادات کە دەشێ بۆ کۆمەڵگای گوندنشین و شارستانی مسۆگەر بکرێت لەوانەش سادەترین دامودەزگا کە خوێندنگایە. هەربۆیە بە ئاشکرا دەبینرێت کوردی کۆچەری کە پێشتر رێژەیەکی هەرە بەرزی دانیشتوانی کوردستانی پێکهێناوە نەخوێندەوار بوون. تەنانەت سەرۆکی خێڵ و تیرەو هۆزەکانیش ئەگەر هەرکام لەو تیرەو هۆزو خێڵانە خۆش بەخت بووبن ئەوە مەلایەکی نیمچە خوێندەواریان هەبوە، بێگومان ئەوەش لە قۆناغەکانی دوای فەتحی ئیسلامیدا، ئەگینا پێش فەتح و بەتایبەتی لە سەردەمی زیاتر بالادەستبونی ئایینی زەردەشتیدا مۆگەکان زیاتر شوێنی تایبەتیان هەبووەو ئاتەشگەکان شوێنی کاروباری ئایینی و جێبەجێکردنی تەقسە ئایینییەکان بوون، بەلام ئایینی ئیسلام راستەوخۆ ئایینی ناو جەماوەرو خەلك بووەو لەو روانگەیەشەوە توانیوویەتی رەگ و ریشەی خۆی دابکوتێ و ببێت بە بنەمای ژیانی ئیداری و کۆمەلایەتی خەلکی سەرباری ژیانی رۆحیان.

مەلا لە ژیانی کوردەواریدا ئەرکی پێش نوێژی و مارەبڕین و یاسین و تەلقین کردنی مردووی کێشاوەو سەرفترەو بەشێك لە زەکات و خێرو خێراتی وەرگرتووەو زۆربەی کات پایەیەکی بلندی کۆمەلایەتی بۆ

دروستبووه له سنووری خێڵ و عەشیرەت یان خەڵکی گوند یان دەستە خێزانێکی کۆچەری پێکەوەدا، بەجۆرێکی ئەتۆ کە زۆربەی کات لە دوای سەرۆك خێڵ یان سەرۆك تیرە ئەم کەسی دووەم بووەو پرس و رای پێکراوەو لەگەڵ ئەوەشدا کە شوێنی سەرەکی ئەم تەنیا مزگەوت بووە بەڵام لەکۆڕو کۆبوونەوەو مەجلیسی دیوەخانی سەرخێڵدا ئامادەبوونی بەردەوامی هەبووەو حیسابی تایبەتیشی بۆ کراوە. ئەمەش ئەوە نیشان دەدا کە لە دێرزەمانەوەو تەنانەت لە سەردەمی ژیانی گەرمیان و کوێستانەوە ئاین وەکو بەشێك لە دەستوورو بەڕێوەبردن تێکەڵاوی کاروباری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای کوردەواری بووە بەڵام نەبۆتە خاوەن دەستووری چەسپاو. بەڵکو سنوری ئیشکردنی دیاری کراو بووە بۆ نموونە لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەگەر کەسێك (زینا)ی کرد سزاکەی کوشتن نیە بەڵکو جۆرێکە لە سزای جەستەیی کە پێشتر لە شێوازی جەڵدە لێداندا ئەنجام دراوە، تەنانەت سزای تاوانی (زینا بالمحرام)یش شێوازی تایبەتی سزادانی خۆیی هەبووەو ئەگەر سزای کوشتن بەسەر ئەنجامدەری زینادا درابێت ئەوە تەنیا لەکاتی ئەنجامدانی تاوانی (زینا بالمحرام)دا بووە. هەڵبەت مەبەست لەم جۆرە زینایەش ئەوەیە کە کەسێك کاری سێکسی لەگەڵ (خوشك و دایك و پور)دا ئەنجام بدات، یان پەیوەندی نزیکی خزمایەتی و خوێن وەکو ئامۆزایەتی یان پورزایەتی یان خاڵۆزایەتی بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێنرێت، بەڵام لە پەیوەندی خێڵایەتی کوردیداو بگرە تاکو ساتەوەختی ئێستاش ئەگەر کەسێك زینای کرد ئەوە بە هیچ شێوەیەك گوێ بەو بنەمایەی شەریعەتی ئیسلام نادرێت و راستەوخۆ کوشتن دەبێتە سزا بەتایبەتی بۆ ئافرەتەکە. ئەمەش بەڵگەی نەبوونی شەریعەتی ئیسلامە بە دەستووری موتڵەقی بەڕێوەبردنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا. لە بەرامبەر ئەم بارە گشتی‌یەدا، لەهەندێ ناوچەی کوردەواریدا کاتێ کچ و کوڕێك حەز لە یەکتر دەکەن و کەسوکاریان رازی نابن پێکەوە خێزان دروست بکەن،

کوڕو کچەکە پێکەوە رادەکەن و خێزانێکی ناشەرعی لە روانگەی ئایینەوە دروست دەکەن، کەچی نەریتی کۆمەڵایەتی کوردی لە تاوانەکەیان دەبورێت و دان بە شەرعیەتی خێزان دروستکردنەکەیاندا دەنێت و کێشەکەشیان بۆ چارەسەر دەکا.

کەواتە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە نەریت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە کۆمەڵگای کوردیدا زۆربەی کات پێ لە سنوورە قەدەغەکانی شەریعەتی ئیسلام دەنێت، دەشێ ئەمە لە کۆمەڵگاکانی تریشدا کە پەیڕەوی ئیسلام دەکەن روویدات، هەموو ئەمانە بەڵگەی ئەوەن کە پەیڕەوی ئیسلامی لەم کۆمەڵگایانەدا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی لە رەگ و ریشەوە بگۆڕێت، هەر لێرەشدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات داخۆ پەیامی ئیسلام دەتوانێت هەموو تایبەتمەندییەکانی نێو داب و نەریتی کۆمەڵگای کوردی هەڵوەشێنێتەوە؟ بێگومان لە رابردوودا نەیتوانیوە ئەوە بکات، هەر ئەوەش یەکێك لە خلسێتەکانی پارێزگاری کردنی کورد لە بنەماکانی کەلتوری خۆی نیشان دەدات، کە سەرباری پرۆسە بەردەوامەکانی داگیرکردن کوردی بە زیندوویی هێشتۆتەوە.

دیارە ناکرێت کاریگەری ئەو بارە نالەبارەی تۆپۆگرافیای کوردستان لەسەر گەشەی کۆمەڵایەتی و شێواندن و دواخستنی پشت گوێ بخەین، بێگومان فاکتەری نالەباری تۆپۆگرافیای کوردستان تاکە هۆکار نیە کە دەوری نێگەتیڤی لەسەر سروشتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردی هەبووە، بەڵکو گەلێك هۆکاری تر هەن هەر لە پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی و سیستەمی ئابووری و بەرهەم هێنان و دەوری شارستانێتیەکانی دەوروبەری رۆڵی داگیرکردنی بەردەوام و کاریگەری هەمەلایەنەی کەلتوورو ئایینە جۆراوجۆرەکانەوە.. تاد، کە نالەباری تۆپۆگرافییش بووەتە هۆکارێکی یارمەتی دەر بۆ کارکردنی نێگەتیفانەی ئەو هۆکارانەی تر. ئەگینا وڵاتانی تریش هەم کە تۆپۆگرافیای نالەباریان

هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە لایەنەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی و بەرهەم هێنان و کەلتوری و مێژوویییەوە ئاسایی بوون، گەشەی سروشتیان نەشێواوە.

دیاردەی تۆپۆگرافیای ناڵەباری کوردستان نەك هەر لە مێژووی کۆندا بەڵکو لە مێژووی نوێشدا رێگای لە نیشتەجێ بوون گرتووەو هۆکارێکی سەرەکی بۆ گەرمیان و کوێستان کردن و خەریك بوون بە کشتوکاڵەوە. بۆ نموونە.. خێڵی جاف کە یەکێکە لە گەورەترین و دیارترین خێڵەکانی کورد تا نزیکەی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم هەر کۆچەر بوون و لە دێهاتەکاندا سەقامگیر نەبوون و لەگەڵ کشتوکاڵ سەروساختیان خۆش نەبووەو بیریان لەسەرحەدو سنوردانان بۆ قەڵەمڕەوو زەوی و زار نەکردۆتەوە. هۆی سەرەکی ئەمەش خەریکبوونی خێڵی جاف بووە بە بەخێوکردنی مەڕومالاتەوە، واتە تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە خێڵی جاف لە قۆناغی شوانکاریدا بووە، ئەمە جگە لەوەی تاکو ناوەڕاستی سەدەی بیستیش ژیانی گەرمیان و کوێستان لای ئەم خێڵە دیاردەیەکی لەبەرچاو بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لە رووی نیشتەجێ بوون و دروستکردنی دامودەزگاکانی کۆمەڵایەتی تایبەت بە قۆناغی نیشتەجێ بوونەوە لەدوا بوون و بگرە تاکو ساتەوەختی ئێستاش کە ئەو خێڵە دیارەی کۆمەڵگای کوردی نیشتەجێ بوون زیاتر لادێ نیشنن و سەرگەرمی بەخێوکردنی مەڕومالاتی خۆیانن و کەمتر پەرۆشی ژیانی شارستانین. بە دەربڕینێکی تر لە رووی کۆنەستەوە لە ژیانی شار بێزارن یان لەگەڵیدا ناگونجێن و رانەهاتوون چونکە بەپێی ئەو بنەما زۆر سادەیەی پەیوەندی شار دەبێ چەمانەوەیەك لەبەردەم ئەم جۆرە پەیوەندییەی شاردا هەبێت ئەگەرچی دامودەزگای کۆمەڵایەتی شار هێشتا وەکو ئەوەی پێویستە زۆر لاوازەو توانای هێنانی دەستووری بەڕێوەبردنی نیە. بەڵام ئەوی لادێ نشین هێشتا خەونی زێڕین بە کۆچ و بارو سەروەرێتی تایبەتی خۆیەوە دەبینێ لە ژیانی گەرمیان و کوێستان

و سایەی رەشماڵدا. لەم بارەیەوە تۆماس بۆیس دەڵێت: زۆربەی کورد خەریکی بەخێوکردنی مەلاوماڵاتن و شوانکارەن و ئەو کارەش وەکو پلەو پایەیەکی بەرز دەنرخێنرێت و دەبێتە هۆی ئەوەی هەرکەسە بە ئازادی لە سایەی یەزداندا بژی. ئەمەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە مرۆڤی کورد گیانی تاکڕەوی تیا بەهێز بووەو هەردەم ویستوویەتی تاك و تەنیاو دوور لەکۆمەڵ و نیشتەجێ بوون بژی و جگە لە پێڕەوو دەستوورو شەریعەتی خۆی پەیڕەوی هیچ پێڕەو و دەستوورو شەریعەتێکی تری نەکردووەو بگرە بە دوژمن و نەیاریش سەیری کردون، هەر ئەمەش بۆتە هۆکارێك بۆ دروستنەبوونی دەستوورو شەریعەتێکی گشتی کەلە بنەڕەتەوە لەسەر بونی زەمینەیەکی چەسپاو دروست دەبێت کە ئەو زەمینەش بەبێ بنیادنان و ئامادەبوونی دامودەزگای کۆمەڵایەتی پێکەیشتوو چەسپاو دروست نابێت.

بێگومان زەمینەی جوگرافی و تۆپۆگرافیا دەوری کاریگەر دەبینن لە دروستکردنی ژێرخانی کۆمەڵایەتیدا ئەگەرچی کوردستان جۆرێك لە حاڵەتی بەشی خۆکردنی لە بەرهەم هێنانندا تیادا دروستبووە، بەڵام ژێرخانێکی ئابوری ئەوەندە پتەوو دەوڵەمەند دروستنەبووە کە هەم پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان و هەم چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان بەوپێیە بخەمڵێنن. لە شێوازی سروشتی پەرەسەندنی ئابوریدا پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان بەشێوەیەکی سروشتی دەخەمڵێن و بەوپێیەش خاوەندارێتی زەویی و هێزی (ماڵ) دروست دەبێت کە ئەویش بەڕیز لە (کۆیلەو خاوەن کۆیلە، جوتیارو دەرەبەگ، کرێکارو سەرمایەدار) پێکدێت، کە هەریەکە لەم دوو هێزە کۆمەڵایەتیە بەرامبەر یەکە خاوەنی کەسیەت و سیفاتی تەواوی کۆمەڵایەتی خۆی دەبێت، پەیوەندی خاوەندارێتی لە شێوەیەکی جێگیردا دەچەسپێ و لەسەر بنەمای ئامادەبوونی هەردوو هێزی کارو خاوەندارێتی پەیوەندی بەرهەم هێنان دروست دەبێت، هەروەها گەیشتنی کۆمەڵگاش بە ئاست و

پەیوەندی بەرهەم هێنان دروست دەبێت، هەروەها گەیشتنی کۆمەڵگاش بە ئاستی پەرەسەندن و پلەی دیاری شارستانێتی لە ئەنجامی کێشەی بەردەوامی سروشتی نێوان ئەم دوو لایەنە بەرامبەرەوە فەراهەم دەبێت، لەم بارەیەوە ئەنجلس دەڵێت: شارستانێتی ئەو پلەی گەشەی کۆمەڵگایە کە لە کۆمەڵدا دەبەشبوونی کارو ئاڵوگۆڕی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ بەهۆی دابەشبوونی کارو بەرهەمی کالآیی کە ئەو دوو دیاردە یەك دەخات دەگاتە ئەوپەڕی گەشەکردنی و ئەو سێ هۆکارەش تیایدا دەبێتە هۆی هەڵگەڕانەوە لە سەراپای کۆمەڵگای پێشوودا(٢٧). لە هەلومەرجێکی وەهاشدا یاسایەکی جێگیرو گشتی بۆ ڕێکخستنی ئەو پەیوەندیانەو چۆنێتی میکانیزمی کارکردنی دروست نابێت. دروستبوونی ئەو دەستوورە سەرەتاییە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان لەگەڵ گەشەسەندن و بەرەو پێشەوەچوونی قۆناغ و ئاستی ژیاندا دەگۆڕێت بۆ یاسایەکی پتەوو بەهێز کە شێوازی دەستووری دامودەزگای کۆمەڵایەتی بەخۆی دەگرێت و لە رووی سروشتی‌یەوە گەشەی کۆمەڵایەتی لەسەر هێڵی ئەو سۆنگەی گەشەی پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان پێکدێت. بە واتا پەیوەندی‌یە ئابوورییەکان شوێن و جێگای دیار دەگرن و دەکەونە پێش شوێن و جێگای پەیوەندییەکانی خوێن و دەمارگیری‌یەوە واتە دەکەونە پێش پەیوەندییەکانی خزمایەتیەوە کە یەکەی خێڵ و عەشیرەت لەسەر بنەمای پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی پێکهاتووە. ئەمەش واتە باڵادەست بوونی پەیوەندییە ئابوورییەکان لەو حاڵەتەدا دێتە دی کە گەشەی کۆمەڵایەتی و شارستانی کۆمەڵ گەشەیەکی سروشتی ئاسایی بێت، بەڵام دیارە ئەوە ئاشکرایە لە کۆمەڵگای رۆژهەڵاتیدا بەگشتی و لە کۆمەڵگای کورددا بەتایبەتی مەسەلەکە پێچەوانەیەو پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی دەکەونە پێش پەیوەندییە ئابوورییەکانەوە.. لە کۆمەڵگای عەرەبیدا پەیوەندییەکانی خێڵ و تایەفە تاکو ئێستا

شوێنێکی دیارو لەبەرچاویان لە ژیانی سیاسی کۆمەڵگادا هەیەو لە زۆر رووەوە لە تێکرای پەیوەندییە ئابورییەکان بە پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنانیشەوە گرنگترن، ئەو رۆڵەی خێڵ و عەشیرەت دەیبینێ ئابوری نایبینێ(٢٨). کەواتە لێرەوە رووبەڕووی ئەو راستی یە دەبینەوە کە نەك هەر خودی تۆپۆگرافیا لە دواخستنی گەشەی ئابوری و پەیوەندییە ئابورییەکاندا رۆڵی نێگەتیفی بینووە، بەڵکو لە پاڵ ئەوەشدا، ناسروشتی پەیوەندیەکانی خێڵایەتی کوردی سەرخانی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایەشی بە ناسروشتی بەرهەم هێنانەوەو ئەم بارە ناسروشتیەش کاریگەری لەسەر عەقڵ و هەستی کۆمەڵگا هەبووەو ئەو عەقلیەتەش واتە عەقلیەتی خێڵایەتی ناسروشتی بەردەوام ناوەندی دەسەڵاتی لەدەستدا بووەو لە سنوری ناوخۆی کۆمەڵگادا دەوریشی هەبووە لە رێگاگرتن لە گەشەو پەرەسەندنی پەیوەندییە ئابورییەکاندا.

لە روانگەی روانین بۆ گۆشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیەوە لەم وڵاتەدا لە هیچ قۆناێکدا پەیوەندی بەرهەم هێنان بەشێوەی سروشتی دروست نەبووە، هەر ئەوەش دەری بینیووە کە سیستەمی ئابوری و سیستەمی کۆمەڵایەتی وەکو سیستەمێکی خاوەن ناسنامە لە رابردوودا دروست نەبێت. کاتێ سروشت لەبار بێت بۆ ئەوەی ببێتە زەمینەیەکی گونجاو و رەوتی مێژوویی و ژیانی کۆمەڵایەتی لەسەر بنیاد بنرێت و لەئەنجامی ئەو لەباربوونەی زەمینەی جوگرافی‌دا پێداویستی‌یە مادیەکانی قۆناغەکانی گەشەی کۆمەڵایەتی و خودی مرۆڤ وەکو کەسیەت دەستەبەر ببێت، کە لە سادەترین شێوەداو بەر لە هەموو شتێ جێگای گونجاو بۆ کشتوکاڵ و ئاو بۆ ئاودێری و جێگای لەبار بۆ نیشتەجێ پێکدێ. دروستبوونی گوندو شار بنەمان بۆ پێکهێنانی زەمینەی لەباری کۆمەڵایەتی، بۆ دروستبوونی پەیوەندییە ئابورییەکان و پەیوەندییە خێڵایەتی ئایینی‌یەکان کە سەرجەمی ئەمانەش دەبنە بنەما بۆ پێکهێنانی زەمینەی دروستکردنی دامودەزگای بەڕێوەبردنی

کۆمەڵایەتی کە ئەوەش یەکەمین خەسڵەتی پێویستە بۆ پێناسەکردنی کۆمەڵگا لە هەر قۆناغێکی ژیانی کۆمەڵایەتیدا و ئەگەر لەم سۆنگەیەوە سەرنجێکی خێرای رابردوومان بدەین ئەوا رێگرێکی پڕ لە مەترسی لە نەبوونی ئەو دەزگا کۆمەڵایەتیانەی بەڕێوەبردنمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە چۆن کۆمەڵگای کوردی لە شێوازێکی پەرت و بڵاوی بێ ناوەندی بەڕێوەبردندا بە درێژایی مێژوو ژیانی گوزەراندوەو چۆن لە کێشمان کێشی هێزی ئابوری و شارستانی دەوروبەریدا بۆری خواردووەو هێندەی تر ئەو ناوەندە چاوەڕوانکراوەی کە پێکنەهاتووە هەڵوەشاوەتەوە. واتە لە مێژووی دوورو درێژی کوردستاندا لەبەر ئەوەی کوردستان نەبۆتە خاوەنی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ئیداری کەلتووری سیاسی خاوەن ئاستامەو لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی مێژوویشدا سیستەمی ئابوری و کۆمەڵایەتیو رێبەرێتی ئەو قۆناغانە پێکنەهاتووە، کوردەواری لە بەردەم پرسیارێکی چارەنووس سازدا ماوەتەوە کە ئەویش ئەوەیە ئایا کورد خاسێتەکانی کۆمەڵگایەکی پێگەیشتوی هەیە؟ ئایا کورد بووەتە کۆمەڵگا؟ ئایا دەشێت کۆمەڵگا بە بێ بوونی سیستەمێکی یەکگرتووی ئابوری و رێبەرێتی پێکبێت؟

بێگومان حاڵەتی دابەشبوونی ناوخۆو پەرتبوون و پەرەوازەیی خێڵایەتی و لاواز ی رایەڵەکانی یەکبوون و نەبوونی دامەزراوی ئابوری کۆمەڵایەتی سیاسی یەکگرتوو لە کوردستاندا کورد دەخاتە بەردەم گومانەوە لەوەی کە کۆمەڵگابێت یان ئەگەر کۆمەڵگاش بێت، ئەوە کۆمەڵگایەکی زۆر سادەو سەرەتاییەو نەبوونی بنەماو پایەکانی کۆمەڵگایەکی پەرەسەندو چ لە ژێرخان و چ لە سەرخان وای لە کورد کردووە کە سەرخانی دەرەوە قەرزبکات، کە زیاتر سەرخانی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیانەیە کە گەیشتوون بە ئاستی کۆمەڵگا، بێگومان ئەو قەرزکردنەش جۆرێك لە ونبوونی ئێمەی دروستکردووە، بەڵام ئەو نووسەرو رۆشنبیرانەی کورد کە توانای شیکردنەوەو تێگەشتن لە

واقیعی کۆمەڵایەتی کوردییان نیە پێیان وای کۆمەڵگای کوردی لە قۆناغی بەمەدەنیبووندایە، ئەگەرچی ناشێت تەسەوری کۆمەڵگای مەدەنەی بەبێ بونی دەوڵەت بکرێت. چونکە دەوڵەت بەرزترین ئاستە کە رۆحی کۆمەڵایەتی بەهۆیەوە گوزارشت لە سەربەستی خۆی دەکات، بەمەدەنی بوونیش تەنیا لەوکاتەدا دەبێ کە رۆحی گشتی کۆمەڵایەتی لە بەرزترین پلەی سەربەستیدا بێت، کە ئەم بۆچوونەش بۆ کۆمەڵگای کوردی پێچەوانەکەی راستەو رۆحی کۆمەڵایەتی نەیتوانیووە گوزارشت لە خۆی بکات بە سەربەستانە.

## سروشتی دیموگرافی لە پشتێنەی سنووری کوردستانداو پەیوەندی بە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و بەناوەندبوونەوە

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە شارە گەورەکانی کوردستان بەشێوەیەکی ئاشکرا لەسەر یان نزیک هێڵە سنووورییەکانی کوردستان لەگەڵ دەرەوەی کوردستاندا دروست بوون کە ئەوەش دەبێتە بەڵگەی نیشاندانی ناجۆرییەك لە شێوازی دابەشبوونی دیموگرافی لە کوردستاندا. هەر ئەوەش وایکردووە کە دیمەنێکی شارستانی بە ئاراستەی دەرەوە خۆبنوێنێ‌و لە ناوەوەشدا جۆرێك لە چۆڵەوانی ببینرێت چونکە ناوەندی کوردستان لە رووی بوونی شاری گەورەوە دەتوانین بڵێین وەکو جۆرێك لە چۆڵەوانی وەهایە. واتە جوگرافیای کوردستان لە روانگەی روانین بۆ کێشی دانیشتوان لە ناوەندا دەتوانین بڵێین وەکو جەستەیەکی بێ رۆح وەهایە. بە مانایەکی تر (زەوی) ماهیەتی ناوەندێتی بوون و ناوەندارێتی نیە لەم وڵاتەدا، بەڵکو پێکهاتەیەکی بێ رۆحەو بێگەوهەرە. کەواتە دەتوانین بڵێین ناوەندی کوردستان جۆرە چۆڵەوانیەکە. بەهەمان شێوە مرۆڤی کورد لە سیماو رووکەشی دەرەوەیدا شارستانی و پێشکەوتووەو کاتێ لێی دەڕوانین پێ‌دەچێت خودێکی خاوەن ماهیەت بێت، خودێك کە خاوەنی بوون و پراکتیك بێت، بەڵام لە راستیدا ئەو رووکەشەی مرۆڤی کورد هاوشانە لەگەڵ رووی شارستانی سنوورەکانی کوردستانداو هەرچۆن جوگرافیای

کوردستان لە ناوەندا بۆشایی و وێرانەیە، مرۆڤی کوردیش تەنیا رووکەشی هەیەو لەو شێوازەی ئێستایدا نە دەتوانێت بوونی خۆی بسەلمێنێت نە هەنگاوی بەرەوچوونە نێو مێژوو هەڵبهێنێت. کە ئەوەش ئاراستە جوولەیەکە بە دژی واقیعی ئێستای مرۆڤی بێ ناسنامەو بێ مێژووی کوردە کە کوردستان وەکو وڵات و کوردیش وەکو نەتەوە تاکو ساتەوەختی ئێستا لەبەر نەبوونی ناسنامەی جیهانێتی بوونی شارستانێت مێژوو کە نیوونەی دنیایان تێدا پراکتیك دەکرێت کە ئەوەش زیاتر لەهەر هۆکارێکی تر پرسیاری (کوردایەتی) بوونی کوردستانی بە مانای ناسنامەو دروستکردنی شارستانێت و مێژوو هەرەس پێهێناوەو رێگای نەداوە دەستەواژەی بە ئاگاهێنانەوەی دنیا لەلایەن کوردەوە دروست ببێت کە گەوهەری دەستەواژەکەش ئەوەیە کە دەڵێت: (منی کورد. ئێمەی کورد دەبێ هەبین) لە هەمان کاتدا بەمەبەستی سەلماندنی ئەو بوونە کار بکات. بێگومان ئەو بوونەش دەبێ بوونێك بێت لەسەر بنەمای دروستکردنی رووداو دروست بووبێت.

ئێستا ئەگەر بگەرێینەوە بۆ ئەو خاڵەی لە سەرەوە دەربارەی شوێنی دروستبوونی شارەکان ئاماژەمان بۆ کرد، ئەوا دەبینین زۆربەی زۆری شارە دیارەکانی کوردستان دەکەونە نزیك یان سەر سنوورەکانەوە، ئەوەش وەکو پێشتر لێی دواین پەیوەندی بەبوونی ئەو دەوڵەت و شارستانێتانەوە هەیە لە مێژووی دێریندا دەوری کوردستانیان داوە. هەروەك سروشتی جوگرافیای کوردستان و تۆپۆگرافیاکەی لە رووی چەق بەستنی چیاکان بەرەو ناوەندو بە ئەندازەیەك کە لە ناوەندی کوردستاندا لە رووی دیمۆگرافیەوە جیاوازییەکی گەورەی لەگەڵ سنوورەکاندا هەبێت. ناوەندی کوردستان لەگەڵ چڕی و سەختی و ناڵەباری تۆپۆگرافیاکەیداو مانەوەی وەکو پانتاییەکی نیمچە چۆڵەوانی کاتێ بەراورد بکرێت بە نزیك سنوورەکان و دروست نەبوونی شارە گەورەکان وەکو پنتی سەرەکی نیشتەجێ بوون لە ناوەندی کوردستاندا

مایەی لێ وردبوونەوەیە. ڕێژەی ئاڵۆزبوونی تۆپۆگرافیای کوردستان لە سنوورەکانەوە بەرەو ناوەند پەیوەندییەکی پێچەوانە لەگەڵ ژمارەی دانیشتوان پێکدێت، بە ئەندازەیەك لە نزیك هێڵەکانی سنووری کوردستانەوە هەتا بەرەو ناوەند بڕۆیت چەند ئاڵۆز و سەختی باری چڕبوونەوەو زیاتر هەڵچوونی چیاکان زیاد بکات، بە پێچەوانەوە ژمارەی دانیشتوان کەم دەکات، کەمی دانیشتوانیش لە ناوچەیەکی بەرفراوانی ناوەندی کوردستانداو پێکنەهاتنی شارو شارۆچکەی دیار لە مێژووی کۆنداو دروست بوونی چەند گوندێکی پەرەوازە یان دواتر چەند شارەدێیەك نەبۆتە بنکەیەك بۆ پێکهێنانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی شارستانی، بەڵکو بە پێچەوانەوە سەرچاوەی سەرەکی ژیان لە نێوەندی کوردستاندا بەخێوکردنی مەڕومالأت بووەو دیاردەی گەرمیان و کوێستانیش ئاشکرابووە.

پێشتر ناوی هەندێ لەو شارانەمان هێنا کە لە نزیك سنوورەکانی کوردستاندا دروستبوون لەوانەش نەینەوا، هەولێر، کەرکوك خانەقین، کرماشان، لوڕستان، سنە، ماردین، دیاربەکر، ئورفە، مەرعەش،.. تاد. ئەگەر سەرنجی ئەم خشتەیەی خوارەوە بدەین ئەوا زیاتر ئەو ڕاستییەکان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە زۆربەی زۆری دانیشتوانی کوردستان لە شارە سنوورییەکاندا دەژین، ئەم خشتەیە دانیشتوان و ڕووبەری شارەکان و ڕێژەی چڕی دانیشتوان نیشان دەدات کە لە ساڵی ١٩٨٥دا بەم جۆرە بووە.

| پارێزگا | ڕووبەر بە کم[٢] | دانیشوان بە هەزار | چڕی کەس/ کم[٢] |
|---|---|---|---|
| کەرکوك | ٩٤٢٦ | ٦٠١ | ٦٤ |
| نەینەوا | – | ٦٦٤ | – |
| هەولێر | – | ٤٤٥ | – |
| کرماشان | ٢٢٦٦٧ | ١٤٦٣ | ٦٢ |
| لوڕستان | ٢٨١٠٣ | ١٣٦٧ | ٤٧ |

| سنه | ٢٥٦١١ | ١٠٧٨ | ٤٢ |
|---|---|---|---|
| دیاربەکر | ١٥٢٥٥ | ٩٢٥ | ٦١ |
| ئەرزەروم | ١٥٧٩٢ | ٦٢٤ | ٤١ |
| ماردین | ١٢٧٦٠ | ٦٥٣ | ٥١ |
| ئورفە | ١٨٥٨٤ | ٧٩٥ | ٤٣ |
| مەرعەش | ٩٨٤٢ | ٦٣٩ | ٩٥ |

ئەگەر سەرنجی دانیشتوانی ئەم شارانەی خشتەکە بدەین کە بەشێکن لە شارە سنوورییەکان نەك هەموویان، کەچی بەگوێرەی ژمارەی سەرجەمی دانیشتوانی کوردستان لە نیوەی هەشتاکاندا نزیکەی نیوەی دانیشتوانی لەو (یانزە) شارەدا دەژین. ئەمەش بەڵگەیەکی رەت نەکراوەیە بۆ ئەوەی کە چڕی دیمۆگرافی لە هێڵە سنوورییەکانی کوردستاندا گەلێك زیاترە لە ناوەندو بەشەکانی تری کوردستان. زۆربەی ئەو شارانەی کە چڕی دانیشتوانیان پتر لە ٦٠ کەسە بۆ هەر کیلۆمەتر چوارگۆشەیەك لە سنوورەکاندا یان نزیك سنورەکانن وەکو کەرکوك و کرماشان و مەرعەش و ئەرزەروم و عەنتاب، لە کاتێکدا چڕی دانیشتوانی کوردستان لە ساڵی ١٩٨٥دا بەپێی ئەو لێکدانەوە وردەکارییەی کە عەبدوڵا غەفور کردویەتی ٤٥ کەسە بۆ هەر کیلۆمەترێکی چوارگۆشە.

هۆی دروستبوونی شارەکانی کوردستان لە پشتێنە سنوورییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری ئابوری کە ئەمیش بەندە بە سروشتی جوگرافی و تۆپۆگرافی کوردستانەوە هەروەك ناکرێت دەوری شارستانێتی وڵاتانی دەوروبەری کوردستان لە مێژووی دێرینـدا لەو بارەیەوە پشت گوێ بخرێت. بەهەرحاڵ کوردستان لەبەر ئەو بارە ناسروشتی‌یەی، گەشەی کۆمەڵایەتیش تێیدا گەشەیەکی سروشتی نەبووە، پەیوەندییەکی ئیفلیجی پێکداچووی خێڵایەتی -فیودیالی- بۆرژوای کۆمپرادۆر لەم

چەند دەیەی دوایی سەدەی بیستدا سیمای ئاشکرای پەیوەندی کۆمەڵایەتیە لە کوردستاندا. لە ئەم بارە تێکەڵاوەشدا پەیوەندییەکی بەرهەم هێنانی جێگیر دروست نەبووە. بەوپێیەش توانای دروستکردنی سەرخانێکی سروشتیش لە ئارادا نەبووەو نەڕەخساوە. هەر بۆیە دەبینین لە کوردستاندا پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان، دەستوور، تەشریع، ئایدیۆلۆژیای چینایەتی، کەلتور، رۆشنبیری و دەستووری ئیتنیکی -ئایینی سیمای سروشتیان بەخۆیان نەگرتووەو شێوەی پێکهاتنی دامەزراویان نەبووەو لەبەر ئەو شێواندنە هەمان شێوەی تێکەڵ و پێکەڵی قۆناغ و چین و توێژەکان ئەمانیش تێکەڵاوێکی هەمەچەشنەی نێو یەکتر بوون و هیچ کامیان خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆیی بە سروشتی هەڵنەگرتووەو لە ئەنجامی ئەوەشدا نەك توانای ئاراستەکردنی بەرەو ئایندەو ناساندنی کورد بە مێژوو، بە جیهان و نمایشکردنی خۆی بۆ دەرەوەی خۆی لە رووی دروستکردنی دام و دەزگای کۆمەڵگای پەرەسەندووە لە سەروی هەموو ئەو داموودەزگایانەشەوە دامەزراوی دەوڵەتەوە زۆر لاواز بووە، بەڵکو لەبری دروستکردنی ئەو دامەزراوو دام و دەزگایانە یاسای دژایەتی کردنی نێوان بەشەکانی ئەو پێکهاتەیە پێکهاتووەو میکانیزمی کارکردن لەنێو خودی ئەو پێکهاتە ناجۆرەدا بۆتە مایەی لاوازی و هەرەس و ونبوونی بنەماکانی یەکگرتن و یەکبوون یان ونبوونی بنەماکانی ململانێی سروشتی لە پێناوی گۆڕانکاریدا، بێگومان رۆحی گۆڕانکاری و بەرەو پێشەوەچوون لە کۆمەڵگادا ململانێی چین و توێژەکانە لە پێناوی بەدەستگرتنی دەسەڵاتدا واتە ئەو سروشتەی دژایەتی کردن لە پێناوی جۆرێك لە یەکبووندایە هەر لێرەوە ئەگەر یەکەمین دەرئەنجامی گەشەی ئاسایی پەیوەندی کۆمەڵایەتی فیودیالی لە ناوەوەڕا دروستبوونی ماکی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بۆرژوازی بووبێت کە ئەویش بەڵگەی دروستبوونی خودی چینی بۆرژوا بووبێت وەکو چینێکی خاوەن سیفات

و خەسڵەتی چینایەتی، ئەوا ئەو تێکچوونی باری گەشەکردنە لە بنیادی پێکهێنەرانەی کۆمەڵگای کوردەواریدا تێکڕای پێکهاتنی کۆمەڵایەتی‌و سەرجەمی ئاستەکانی سەرخانیشی شێواندووە. هەر لەوێوە ئیقاعی جێگیربوون و لەبەرگرتنی شێوازی سروشتی گەشەی کۆمەڵایەتی ئیفلیج بووە. ئەوەش بارێك بووە راستەوخۆ پەیوەندی بە کەسیەتی نەتەوەیی کوردەوە هەبووە، باری کۆمەڵایەتی لەو جۆرەو ژێرخانێکی ناتەواو و کەلتورێکی کۆلۆنیکراویش بوونەتە بەشێك لە بنەمای دروستبوونی کەسیەتی کوردی لەو بارە تێکشکاوەیدا.

ناکرێت هەروا لە رووکەشەوە سەرنجی باری سیۆسیۆلۆژی کوردی بدرێت و بێ شۆڕبوونەوە بۆ ئاستە شاراوەکانی ئەو پێکهاتەیەو میکانیزمی کارکردنی توخمە پێکهێنەرەکانی قسە بکرێت و دەربارەی شۆڕش و رزگاری و سەربەخۆیی و دەوڵەت گفتوگۆ بکرێت، چونکە ئەو سروشتە شێواوەی گەشەی مێژوویی کۆمەڵگای کوردەواری زۆر بنەمای ئاسایی شێواندووە کە ناشێت دوور لە بە سروشتی کردنەوەی یان گێڕانەوەی ئەو بنەما شێواوانە بۆ باری سروشتیان یان جێگاگرتنەوەیان بە ئەڵتەرناتیڤی گونجاو (کە ئەمەی دواییان کارێکی بەگرێ‌و گۆڵە و مایەی گومانە) بتوانێت هەنگاوی بەرەو پێشەوە بنێت. لێرەوە جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ قسەکردن لەسەر کاریکەری فاکتەری جوگرافی کوردستان و دەوربینینی لە رێگاگرتن لە گەشەی سروشتی کۆمەڵگای کوردیدا.

ئەگەر قۆناغی فیودیالی کوردی بە شێوەیەکی سروشتی دروستببووایە و پاشماوەی دامودەزگای کۆمەڵایەتی لە جۆری دامودەزگاکانی (دەوڵەتۆچکەی شار)ی میزۆپۆتامیا دروست بووایە ئەوا دەشیا لەسەر پاشماوەی ئەو دامودەزگایە وەکو پاشماوەی کەلتوری بەڕێوەبردنی دەوڵەتی لە کوردستاندا لە قۆناغی فیودیالیدا دەوڵەتی خێل بەو شێوەی ئیبن خەلدون باسی دەکات لە لای عەرەب لە کۆمەڵگای کوردیشدا

دروستببوایە، بەجۆرێك كە پەیوەندی خوێن و دەمارگیری گەوهەرو رۆحی دروستبوونی بووایە. لەوێشەوە دەشیا ئەو دەوڵەتەی خێڵ سنوورەكانی خێڵی بەجێ بهێشتایەو ببوایەتە دەوڵەتی نەتەوە. خودی ئیبن خەلدون دەڵێت: دەوڵەتی ئەمەوی دەوڵەتێكی گشتی نەتەوەی عەرەب بوو ئەگەرچی لە بنەڕەتدا دەوڵەتی خێڵێكی تایبەتی لە خێڵەكان بوو، كە ئەویش خێڵی "بنيي اميه"یە. لە راستیدا دەشێ بەو دەوڵەتە بگوترێت دەوڵەتی عەرەبی ئەمەوی بووە.

دەوڵەتی عەباسیش گەرچی دەوڵەتی خێڵێكی عەرەب بووە بەڵام وەكو دەوڵەتی سەرجەم خێڵە عەرەبەكان خۆی نیشان داوە(٣٠). ئەم دەوڵەتانە سەرباری ئەوەی كە لە سنووری پێكهاتەو دەسەڵاتی خێڵایەتیدا دروست بوون، بەڵام توانیوویانە سنووری خێڵ ببەزێنن و بگەنە ئاستی نەتەوە. بەوپێیەش دامودەزگای بەڕێوەبردن لە شێوازی بەڕێوەبردنی خێڵەوە بگوازرێتەوە بۆ ئاستی دامودەزگای دەوڵەت گەرچی بنەمای دروستبوونی ئەو دەوڵەتە خێڵایەتیی بووبێت و لەلایەكی تریشەوە فاكتەرێكی تری بەهێز دەوری لە بنیادنانیدا بینیووە كە ئەویش ئایینی ئیسلام بووە چونكە سەرباری هەموو پێودانگە كۆمەڵایەتیەكان هەریەكە لەو دوو دەوڵەتە (ئەمەوی و عەباسی) وەكو دەوڵەتی ئیمپراتۆری ئیسلامی ناسراون. گەرچی هەریەكە لەم دوو دەوڵەتە لە تێڕوانینی ئیبن خەلدونەوە دەوڵەتی خێڵ بووبن بەڵام توانیوویانە بگەنە ئاستی بوون بە دەوڵەتی نەتەوەی عەرەب و لەسەر وەختی خۆیشیدا دەوڵەتی ئومەتی ئیسلام بوون. هۆی باڵادەست بوون و گەیشتنی ئەو دوو دەوڵەتە بە ئاستی دەوڵەتی نەتەوەیی عەرەبی بە كاریگەری ئیسلام بووە چونكە ئایینەكە هەر زوو سنووری خێڵایەتی و بگرە نەتەوایەتیشی بەزاندووە. دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی بۆ بەڕێوەبردنی كۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامی دروستبوون و دەوڵەتی دەسەڵاتداریش بوون بەسەر سەرجەمی نەتەوەو كۆمەڵگا

مسـوڵمانەکانداو دامودەزگـاو دەسـتوورو شـەریعەت و بڕیارەکـانی ئـەم ئایینە بنەمای بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی و سیاسی و کۆمەڵایـەتی و ئابوری بووە، گەرچی ناکرێت پەیوەندی کۆمەڵایەتی خێڵەکی (بەدو)ی عەرەبی لەو قۆناغە مێژووییەدا پشت گوێ بخریت، بەڵام بـە گوێـرەی کۆمەڵگای کوردەواری هەروەك گەشەی سروشتی چۆن لەژێر کاریگەری سروشـتی جوگرافـی و تۆپۆگرافیـاو چـەندین هۆکـاری تـردا شـێواوەو لەهەمان کـاتدا تێکشـکاندنی کـەلتوری و ئـایینی کـوردی بۆتـە مایـەی دروستکردنی بۆشاییەکی گەورەو ئامادەکردنی مرۆڤی کورد بۆ ون بوون و لەوێشـەوە نـەك بنـەمای پێکهێنانی دەوڵەتی دینـی کـوردی لـە جـۆری ئەمەوی و عەباسی عەرەب دروست نەبووە. بەڵکو ئایین نەیتوانییوە لـە کوردستاندا ببێتـە هـۆی پێکهێنانی فیدراسیۆنی خێڵەکانیش، ئەمـەش یەکـەم لەبـەر ئـەوەی لـە کوردسـتاندا کـەلتورێکی ئـایینی سـەربەخۆی کوردی نـەبووە، کـەلتوری ئیسـلام پـەیوەندی بـەردو نـاوەندی فـەرمانی ئیسلامی ئاراستە کردووە کە ئەوەش بۆتە هۆی لاوازی و کوشتنی هێزی ناوەندو ناوەندی دەسەڵات لە کوردستانداو پێکهاتنی لەسەر جوگرافیای کوردستان دواخستووە.

داخـوران و لەبـەر رۆیشـتنی ئـابوری کوردسـتانیش بـەهۆی بوونـی دەوڵـەت و دەسـەڵاتی شارسـتانی بـەهێزەوە لـە وڵاتـانی هاوسـنووری کوردستاندا زیاتر بوونەتە هـۆی رێگاگرتن لـە دروستبوونی (نـاوەندی) سـەربەخۆو پێگەیشـتووی ئـابوری لـە کوردسـتاندا. هـەر بـەو پێیـەش سەرخانی سەربەخۆش پێکنەهاتووە. بە مانایـەکی دی گرفتـی سـەرەکی لـە مێـژووی کۆمـەڵگای کوردەواریـدا دەگەڕێتـەوە بـۆ دروسـتنەبوونی ژێرخانی ئابوری پتەو کە نەخشەڕێژی سـەرخانێکی ئـەوتۆی بکردایـە تێکـڕای پەیوەندییـەکانی بەرهـەم هێنـان لـە ئاسـتێکی گەشـەکردووی ئـەوتۆدا بوایـە کـە هـەر قۆناغـەو خەسـڵەتی مێژوویـی و کۆمەڵایـەتی سروشـتی خۆیـی هەڵبگرتایـەو لەسـەر ئـەو بنەمایـەش قۆنـاغی دواتـر

دەستی پێ بکردایە. بەڵام لە کۆمەڵگای کوردیدا ئەو بارە دروست نەبووەو بگرە بەدرێژایی مێژووی کورد ئەگەر سەرنج بدەین پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە سنووری پەیوەندی شوانکارەیی و خێڵایەتیدا گیریان خواردووەو ئەویش وەهای کردووە جۆرێك لە هەرێمگیری پێك بێت و تاڕادەیەکی بەربڵاویش ببێتە خەسڵەتی باوی کۆمەڵگای کوردی.
ئەوەیش لە راستیدا بریتییە لەو پەیوەندییە دەمارگیرییەی لە کۆمەڵگای عەرەبیدا ئیبن خەلدون کردوویەتی بە بنەمای (ئاوەدانی و بنیادنان- العمران) لەسەر ئەوەش لە مێژووی عەرەبدا دەوڵەتی خێڵ دروستبووە.
لە راستیدا دەمارگیری ئەو پەیوەندییەیە کە لە ئەنجامی پیادەکردنیدا هەرێمگیری لێ دروست دەبێت، چونکە دەمارگیری بریتییە لە یەك لایەنی و تاك سۆنگەیی.
ئەگەر لە بنەڕەتەوە دەمارگیری وەکو پەیوەندی خوێن و خزمایەتی خۆی بنوێنێ، بەڵام لە راستیدا خەسڵەتێکی لە قاڵب دراو نیە لە سنووری پەیوەندی خوێن و خزمایەتیدا بمێنێتەوە بەڵکو لە راستیدا بریتییە لە پەیوەست بوون بە هۆزێك، تیرەیەك، خێڵێك، ناوچەیەك، شارێك، هەرێمێك، حیزبێك، تەریقەتێك و.. لە ئاستێکی بەرفراوانتردا روانین بۆ زمان و ئایین و رەگەزو نیشتمانێك. بەڵام دەمارگیری کە دواپلەی دروستکردنی دەوڵەت بووی لای عەرەب، لای کورد نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەو وەکو بارێکی (هەستی) سەرکوت کراوو چەپێندراو ماوەتەوەو لە قۆناغی بەر لە گەیشتن بە ئاستی پێکهێنانی دەوڵەتدا چڕ بۆتەوەو بارێکی نێگەتیفی دروست کردووە کە ئەویش لەبری بڵندبوون دووچاری (لادان- انحراف) هاتووە. بە مانایەکی تر دەمارگیری کوردی لە پلەیەکی نزمی دەسەڵاتدا روویەکی شەڕانگێزانەی هەیە کە ئەوانی تری پێ قبوڵ ناکرێت و هەموویان رەت دەکاتەوە بۆیە بە ئاشکرا لە درێژەی مێژووی زانراوی کورددا تاکە عەقڵێك باڵادەستە کە ئەویش عەقڵی خێڵەو دەرئەنجامی دەمارگیرییەکی ناسروشتی چەپێندراوە کە

لەسەر بنەمای ستراتیژێك کارەکات کە دەڵێت: تەنیا خێڵ یان ناوچە یان شار یان هەرێم یان حیزب یان مەزهەب یان ئایینەکەی خۆم، ئەوەش سەرەتای گەوهەری نیشکردنی عەقڵێکە کە تەنها خۆی بە حەقیقەتی رەها دەزانێت و لەوێوە تێڕوانینی خۆ بە (خودا) زانین لەلایەن سەرخێڵ و سەرۆکی حیزب و لێپرسراوی ناوچەو رابەری ئایینەوە لە کۆمەڵگای کوردیـــدا دروســتبووە، دیـارە تـێڕوانینی خوایانـــەش بریتی‌یـــە لـــە رەتکردنەوەی هەموو ئەوانی تر کە ئەوەش تەنیا بۆ خودی خواوەند راستەو مرۆڤ ناگاتە ئاستی ئەو پێناسەیەی کە شایەنی رەتکردنەوە نەبێت. هەر لەسەر ئەم بنەمایەشە کە بەدیموکراتی کردنی رۆژهەڵات و کۆمەڵگا خێڵایەتیەکان بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی لە سنووری خەون و خەیاڵدا دەمێنێتەوە چونکە یەکەمین هەنگاوی بەرەو بە دیموکراتی کردنی کۆمەڵگا لە بەدیموکراتی کردنی پەیوەندییە ئابوورییەکانەوە دەست پێدەکات. بەڵام کاتێ لێرە شێوازی پێکهاتن و دروستبوونی ئەو بارەی ئابوورییە نائاشکرا بێت و سیفاتەکانی دیاری نەکرابێت و تارادەیەکی زۆریش شێوەیەکی خێڵایەتی-فیودیالی هەبێت، چۆن هەروا بە ئاسانی دیموکراتیزە دەکرێت؟ ئەوەی لێرە لە بارەی دیموکراتیەوە دەگوترێت تەنیا رووی سەرخانێکی قەرزکراوە هەر بۆیە توانای پیادەکردنی نیە.

شێوازی پەرتبوون و دابەشبونی پێکهێنەرەکانی کۆمەڵی کوردی لە خێڵ و عەشیرەتەکان بەپێی ناجۆری باری تۆپۆگرافیای کوردستان یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکیانەی کە بووەتە بەربەست لە بەردەم دروستبوونی تاکە سیستەمێکی ئابوری دیاری کراوداو بەوپێیەش ئەو سیستەمە ئابورییە کۆنترۆڵی هەموو کۆمەڵگا بکات و دیوارەکانی نێوان بەشە هەمەجۆرەکانی ئەم کۆمەڵگایە بروخێنێ و یەکەیەکی یەکگرتووی لێ بەرهەم بهێنێت، رەنگە بەشێوەیەکی راست و دروست تەنیا لەکاتی ئەو یەکبوونەدا بە دەستەیەکی ئیتنیکی بگوترێت کۆمەڵ.

دیاره پێکنەهاتنی ژێرخانێکی کۆمەڵایەتی پتەوو چەسپاو لە کوردستاندا لە قۆناغە جیاجیاکاندا کاریگەری دیاری هەبووە لەسەر شێوازی سەرخان. سیستەمی شێواوی خێڵایەتی لە کوردستاندا ئەگەرچی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ئابووری چەسپاو نەبووە بەڵام وەکو سەرخان ئامادەبوونێکی ئاشکرای هەبووەو تاکو ساتەوەختی ئێستاش بەردەوامە. دیارە لە هەلومەرجێکی لەم جۆرەشدا دامودەزگای سنووورداری بەڕێوەبردنی کۆمەڵایەتی خێڵایەتی دەرکەوتووە.. دامودەزگای خێڵایەتی بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە عادات و تەقالید دەبەستێت و خۆپارێزە، بە کورتی کۆمەڵگای لەم جۆرە زۆر بە ئاگاوە دەسەڵاتی بڵندی خۆی بەسەر خێڵەکانی دەوروبەریدا بەکاردێنێ(٣١) ئەگەر بێت و سەرەتایەکی سادە لە ئاستی دروستبوونی ناوەندی دەسەڵاتدا پێك بێت و خێڵ ئامادەبوونی ئەوەی تێدا بێت کە ئەو دامودەزگایانە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبردنی خێڵایەتی پێك بهێنێ و هەرەمی فەرمان و دەسەڵات پیادەکردن دروست بکات، ئەوە لە هەنگاوی دواتردا هەوڵدەدات خێڵەکانی تر رابکێشێتە ژێر فەرمانی خۆیەوە. هەروەك زۆربەی میرنشینە کوردەکان چۆن ئەو رێگایان لەبەر گرتووە بە مەبەستی فراونکردنی سنووری دەسەڵاتی خۆیان.

لە کاتێکدا خێڵێکی دەسەڵاتدار هەوڵیداوە لە رێگای هێزەوە خێڵەکانی تر بخاتە ژێر سایەی دەسەڵاتی خۆیەوە ئەوە خێڵەکانی تر ئەوەیان پێ قبوڵ نەکراوەو لە بەرامبەر ئەوەدا بەهێز دژی ئەو کارە وەستاون، ئەنجام لاوازبوونی ئەو دەسەڵاتە ناوچەییانە روویداوەو روخاندنی میرنشینەکان لە ئەنجامی ئەو ستراتیژە نادروستەدا روویداوە. بەتایبەتی لە کاتێکدا کە نە خێڵ بە تەنیاو نە میرنشینەکانیش توانایەکی سەربازی ئەوتۆیان نەبووەو دەسەڵاتێکی ناوچەیی بوون، هەم ناکۆکی نێوان بنەماڵەی میرنشین بەگشتی لەنێو خۆیانداو لەلا یەکی تریشەوە ناکۆکی نێوان بنەماڵەی میرنشین لەگەڵ

جەماوەری سنووری میرنشینەکەیاندا هۆکارێکی تری ئەو لاوازییە بووە، ئەمە جگە لە ناکۆکی خۆبەخۆی خێڵەکانی سنووری هەر میرنشینێك کە هەموو ئەمانە رۆحی یەکبوون و یەکێتیان لەناو ئەو دامەزراوە سنووردارانەی کورددا لاواز کردووە. بەتایبەتیش لەبەرئەوەی چ یەکەی خێل بە تەنیاو چ دەسەلاتە سنووردارەکانی میرنشین لەبەر لاوازی ژێرخانی ئابوری کە ئەویش دەرئەنجامی تۆپۆگرافیای نالەباری کوردستان بوە نەبوونەتە خاوەنی دەسەلاتێکی ئیداری سیاسی پتەوو بەهێز و پەیوەندییە ئابوورییەکان کۆنترۆلی پەیوەندی و جوڵە کۆمەلایەتیەکانیان کردبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە پەیوەندییە ئابورییەکان لە پەراوێزی خودی پەیوەندی خێڵ و گەوهەری دەمارگیریدا بوون. هەموو دەسەلاتێکیش چ دەسەلاتی بەرهەم هاتووی خوێن و دەمارگیری بێت چ دەسەلاتی ئیتنیکی- ئایینی یان سیاسی و ئەخلاقی ئەگەر دەسەلاتی ئابوری لە پشتیەوە نەبێت و دروستکەرو بزوێنەری ئەو دەسەلاتە خۆی بۆ رانەگیرێت رووبەرووی هەرەس و شکست دەبێتەوە.

ئەگەر سەرنجێکی زۆربەی هۆزو تیرەو خێڵەکانی کوردستان بدەین زۆربەیان ناوێکی گەورەن و سەرۆکەکانیشیان ئاغایەك، بەگێك یان شێخێکی بێ دەسەلات و بێ نفوزن چونکە دەسەلاتی ئابورییان نیە، ئەم بارەش کردونی بە راعیەکی بێ رەعیەت و ناچار بۆ سەلماندنی گەورەیی و پیرۆزی خۆیان پشتیان بە بەلگەنامەیەکی مەعنەوی وەهمی بەستووە بۆ سەلماندنی گەورەیی و پیرۆزی خۆیان کە ئەویش بریتییە لە "درەختی بنەماڵە" کە ئەوەش لەبەر دواکەوتوویی کۆمەڵگای کوردی تاڕادەیەك بووەتە هۆی پەیداکردنی پلەو پایەیەکی مەعنەوی. بەلام لە رووی دەسەلاتی ئابورییەوە چ راعی و چ رەعیەتەکانی هەردووك لاواز بوون و تەنانەت توانای دابین کردنی ژیانیشیان بەتەواوەتی نەبووە. لە هەلومەرجێکی وەهاشدا بواری دروستبوونی دەسەلات لاواز بوومو نەڕەخساوە، بگرە توانای لێك نزیك بوونەوەی خێڵەکانیش نەبووە

چونکە یەکێك لە هۆکارە هەرە سەرەکیەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی فاکتەری بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتیە، بە مانایەکی تر پەیوەندییە ئابورییەکان دەوری کاریگەر دەبینن لە بنیادنانی شێوازی ئەو پەیوەندیانەدا. ئەگەرچی ناتوانرێت بە پشت گوێ خستنی هەریەکە لەو دوو لایەنە لەویتریان بڕوانرێت. بەم جۆرە ئەو بارە لاوازو شلۆقەی پێکهاتنی زۆربەی خێڵەکانی کوردستان بە کاریگەری نالەباریی سروشتی جوگرافیاو تۆپۆگرافیا ڕێگای دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵەکانی نەداوە کە دواجار جۆرێك لە دامودەزگای کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبردنی بالایشی لێ فەراهەم ببوایە. هەر ئەو بارە ناسروشتی‌یە کە بەربەست بووە لە ڕێگای دروستبوونی پەیوەندی خێڵایەتیدا بە هەموو ماك و بنەماکانیەوە وەکو پەیوەندییەکی خاوەن خەسڵەتی کۆمەڵایەتی، بۆتە مایەی درێژە پێدانی قۆناغی ژیانی خێڵایەتی لە کوردستاندا چونکە شێوەی ناتەواو و ئیفلیجی وەهای کردووە کە گەشەیەکی ئاسایی نەکات و لەو ئاستەدا نەبێت کە بگوازرێتەوە بۆ قۆناغی دواتر، هەر بۆیە بە ئاشکرا دەبینرێت ئەو مێژووەی کە زۆربەی کۆمەڵگاکان لە پەیوەندی خێڵەوە بۆ کۆتایی هاتنی پیاتێپەڕبوون، دەوڵەتی دینی و دەوڵەتی فیودیالی و تەنانەت لە هەندێ ولاتدا ئیمپراتۆری گەورەی لێ دروستبووەو شارستانێتی گەورەشیان بەرهەم هێناوە، کەچی لە کوردستاندا ئەنجامی پەرەسەندن و تێپەڕبوون بەو قۆناغەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا واتە قۆناغی فیودیالی خێڵایەتی جگە لە دروستبوونی دامەزراوی میرنشینی لاواز ئەویش لەم سەدانەی رابردوودا هیچی تر دروست نەبووە. دیارە دامەزراوی میرنیشنیش ئەگەر بەراورد بکرێت بە دامەزراوی دەوڵەت ئەوە دامەزراوێکی سەرەتایی‌یەو بەگوێرەی کوردیش ئەوە نیشان دەدات کە گەشەی کۆمەڵایەتی نائاسایی و ناسروشتی لەم کۆمەڵگایەدا لەبری دامەزراوی دەوڵەت دامەزراوێکی بچوکترو لاوازتری بەرهەم هێناوە کە ئەویش دامەزراوی میرنشینە(٣٢).

ئەگەر سەرنجی وڵاتانی گەشە ئاسایی بدەین ئەوا دەبینین کە خێڵایەتی و کەلتوری ئایینی کەوتوونەتە پەراوێزی عەقڵی سیاسی کۆمەڵگاوە و توانای ئەوەیان نەبووە ببنە توخمێکی بەهێز لە دروستکردنی دامودەزگای بەڕێوەبردنی کۆمەڵایەتیدا. بە مانایەکی تر "گرژی دەمار" لە رووی سروشتی بڵندبوونەوە لە دروستکردنی دەوڵەتدا دەورێکی وەهای نەبینیووە لە دەوڵەتی شێواز رۆژئاواییدا و وەکو (یەك تای) ئایینی نەماوەتەوەو دەرگاکانی پەیوەندی و لێدوانی لەسەر خۆی بەرووی ئەوانی تردا داخستبێت و بواری گفتوگۆی لەگەڵ ئەوانی تردا سڕیبێتەوە، بەڵکو ئەو واتە عەقڵی سیاسیو کەلتوری ئاینی رۆژاوا ئەو دەرگایانەی بەجۆرێك لە کراوەیی بەجێهێشتووەو بواری ئاخاوەتنی بەکراوەیی هێشتۆتەوە ئەوەش دروستبوون و ئامادەکردنی پانتاییەکە بۆمومارەسەکردنی دیموکراسی.

لە رۆژهەلات بە گشتی و کۆمەڵگا دواکەوتووەکانی وەکو ئێمەدا بەتایبەتی پەیوەندی و تێڕوانینی خێڵایەتی و یەك لایەنە سەیرکردن بوون بە بنەمای ئایدیۆلۆژیای بالادەست و عەقڵی سیاسیش بۆتە پاشکەوتوو پەراوێزی ئەو تێڕوانینە، بە مانایەکی دی خوێن و دەمارگیری بنەمای دروستبوونی دەوڵەت بوون، ئەویش بۆچوونی خوایانەو هەرێمگیری دروست کردووە چونکە لە بنەڕەتەوە ئەوانی تری رەت کردۆتەوە، بەلام بەگوێرەی مێژووی کورد نە شێوەی رۆژئاوایی و نە شێوەی رۆژهەلاتی دروست نەبووە، ئەویش لەبەر ئەوەی نە خێڵایەتی و نە ئاین نەبوونەتە پاشکۆی عەقڵی سیاسی چونکە لە بنەڕەتەوە عەقڵی سیاسیمان بوونێکی ئەوتۆی نەبووەو بووەتە پاشکۆی عەقڵی خێڵایەتی چوکە لە بنەڕەتەوە عەقڵی سیاسیمان لە ئاستێکی لاوازدا بووەو بۆتە پاشکۆی عەقڵی خێڵ و ئایدیۆلۆژیای ئایینی ئەگەرچی ئایدیۆلۆژیای ئایینی لە کوردستاندا لە دوای پرۆسەی فەتح شوێنی عەقڵی سیاسی گرتۆتەوە، ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە لە کوردستاندا

عەقڵ و ستراتیژی خێڵایەتی جێگای عەقڵی سیاسی و ستراتیژی نەتەوایەتی گرتۆتەوە. لە کاتێکدا کە دەمارگیری عەرەبی بووەتە هۆی دروستکردنی دەوڵەتی خێڵایەتی عەرەبی، دەمارگیری نەیتوانیوە ببێتە بنەما بۆ دروستکردنی دامەزراوێکی لەو جۆرە واتە دروستکردنی دەوڵەتی خێڵ لە کۆمەڵگای کوردیدا. چونکە خێڵی کوردی لە رابردوودا نەیتوانییوە دەمارگیری بکاتە بنەمای پێکهێنانی دەوڵەت. ئەویش لەبەر دروست نەبوونی دەمارگیری کوردی و بەناوەندبوونی ئینتیما لە سنووری تەسك و داخراوی جوگرافیای کوردستان و لە پانتایی هەستی کوردیدا. ئەگەر سەرنج بدەین کاتێ دەمارگیری عەرەبی دەوڵەتی وەکو ئەمەوی و عەباسی دروستکردوە بە پشت بەستن بە کەلتوری ئاینی کەچی نەك هەر لەوکاتەدا بگرە لە مێژوویەکی‌زۆر دواتریشدا دەمارگیری کوردی میرنشینە لاوازەکانی دروستکردووە.

پێشتر ئاماژەمان بۆ باری داخورانی جوگرافیای کوردستان کرد بە ئاراستەی دەرەوە بەتایبەتی لە باشووری رۆژهەڵاتەوە. ئەم باری داخورانە وای کردووە کە لەمپەرێکی سنووری یان جیاکەرەوەی تەواو ئاشکرا لەنێوان کوردستان و عێراق یان کوردستان و بەشێکی ئێراندا نەبینرێت. ئەگەرچی هەندێ لە مێژوونووسان بێ لەبەرچاوگرتنی تۆپۆگرافیا وایان نیشانداوە کە زنجیرە چیایەکی نزمی وەکو حەمرین لەمپەرێکی ئاشکرایە بۆ جیاکردنەوەی کوردستان لە عێراق، بەڵام حەمرین نەیتوانیووە ببێتە لەمپەرێکی بەهێز. چونکە نە سروشتی تۆپۆگرافیای ئەم دیوو ئەو دیووی جیاوازییەکی ئەوتۆیان هەیە، نە خۆیشی جیاوازییەکی ئەوتۆی هەیە لەگەڵ سەرجەم گردو بانەکانی ئەم دیوو ئەو دیویدا.

نەبوونی سنورێکی سروشتی دیاری لە جۆری چیا، رووبار، دەر یان بەشێوەیەکی گشتی دیاردەی تۆپۆگرافی هەست پێکراو لە خاڵێکی دیار کراودا بۆ جیاکردنەوەی کوردستان لە دەرەوەی خۆیی و زیاتریش

نزیکـی شـارەکانی لـە سـنوورەکانەوە وەهـای کـردووە کوردسـتان پەیوەندییـەکی بـەهێزی ئـابوری و کۆمەڵایـەتی و ئـایینی بـە وڵاتـانی دراوسێیەوە هەبێت، لە کاتێکدا دروستبوونی شارەکان لە سنورەکانی کوردستاندا وەك گوتمـان لەلایـەك لەبـەر لـەباربوونی سـنوورەکان نزیـك دەوڵەتانی دەرەوە بووە لەرووی بوونی زەوی کشتوکاڵییەوە کە ئەوەش بۆتە هۆی نیتشەجێبوون، لەلایەکی ترەوە کاریگەری نیتشەجێ بوون و دەرکـەوتنی شارسـتانی لـە وڵاتـانی هاوسـنووری کوردسـتاندا بۆتـە فاکتەری یارمەتی دەری دروستبوونی شارە سنوورییەکانی کوردستان، ئەمەش وەهای کردووە نیشتەجێ بوون لەلایەك لە ناوەندی کوردستاندا لاواز بێـت و لەلایـەکی تـرەوە چـڕی دانیشـتوان بکەوێتـە هێڵـە سـنووریەکانەوە بـەپێی ئـەو شـێوە دابەشـبوونەی دانیتشـوان و جێگیربوونیـان نـاوەندی کوردسـتان پانتاییـەکی نیمچـە چـۆڵ بێـت و لەلایەکی تریشـەوە ناوەند ئەو هێزەی نەبێت لە رووی قورسـی رێـژەی دانیشتوان و رێژەی بەرهەم هێنانی ئابوریەوە ببێتـە پێتـی یـان نـاوەندی دەسەلات. بەڵکو دەسەلات لە کوردستاندا چەند ناوەندێکی هەبێت و هەر ناوەندەش بەپێی شوێنی دابەشبوونی دانیشتوان و هەروەها بـەپێی ناوەندی دەسەلاتی خێڵ و عەشیرەتەکان لە رابردوودا دابەش بووبێت و لە مێژووی نوێشـدا سەرباری دابەشکردنی نیـداری کوردسـتان بەسـەر چەند دەوڵەتێکدا، بەلام لە سنووری هەریەکە لەو بەشانەشدا ناوەندی دەسەلات بەپێی ناوەندی دەسەلاتی خێلایەتی لە رابردووداو دەسەلاتی حیزبە ستراتیژ خێلایەتیەکانی کورد لە ماوەی دوایدا تاکو ئێستا دابەش بووبێت و بـەرێوە بچێـت. بـە واتـا لـە کوردسـتاندا ژمارەیـەك نـاوەندی دەسـەلات ئـابووری و سیاسـی و کۆمەڵایـەتی بـە درێژایـی مێـژوو پێکهاتووەو سەرجەم ئەم ناوەندانـەش لەبەر ئەوەی بـەپێی سروشـتی چـڕی دانیشـتوان دروست بـوون و بەتایبـەتی دەسـەلاتە ئابوریـیـەکان کەوتونەتـە هێڵـە سـنوورییەکانەوەو هەریەکـەش تارادەیـەك جۆرێـك لـە

خەسڵەتی سەربەخۆیی سنووررداری تایبەتی خۆیی هەبووەو پەرتبو و دابڕاو بووە لە ناوەندە هاوشێوەکانی تری دەسەڵات کەیان ناوەندە ئابوریە سنوور تەسکەکان بوون یان ناوەندە خێڵایەتیە ئیداریە داخراوەکان بوون یان ناوەندە مەزهەبییە جیاوازەکان بوون، لە روانگەی روانین بۆ دروستبوونی شارەکانیش لە کوردستاندا ئەو جۆرە تێڕوانینە هەبووەو هەر شارە وەکو یەکەیەکی جیاواز و بێ پەیوەندی بە شارەکانی ترەوە دروستبوون کە ئەو تێڕوانینە تاکو ئێستاش لە کوردستاندا هەستی پێدەکرێت. ئەمەش دیاردەیەکی ناسروشتییە کە لە بنەڕەتەوە شێوازی دابەشبوونی دانیشتوان بەم جۆرە کەوتۆتە سنوورەکانەوە. دیارە ئەوەش پەرەسەندنێکی نائاسایی دروست دەکات چونکە بەبێ پێکهاتنی ناوەندی سەرەکی دەسەڵات لە مێژووی گەشەکردنی هەر گەل و وڵاتێکدا وەکو پنتێکی دیاریکراو کە ببێتە چەق و ئەوەش زیاتر بە ئاراستەی ناوەندی جوگرافی یان چەقی دروستبوونی بڕیاری ئیداری ئاراستەبکرێت.

نەبێ سەرجەم پنتە ئابوریو سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی دەسەڵات کە شار دروستیان دەکات لە هەموو لایەکەوە بەهەموو ئاراستەکان وەکو ناوەندێك ببێتە هێز یان چەقی پێکەوە بەستنی بەش و ئاستەجیاوازەکانی کۆمەڵگا. بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە لە کوردستاندا ئەو ناوەندە وەکو چەقی کۆکەرەوەی بەشەکان و وەکو چەقێ کە کەسیەتی دەسەڵاتێکی خاوەن ناسنامەو بە نفوز و باڵادەست بێت بەسەر هەموو کۆمەڵگادا دروست نەبووە، چ وەکو ناوەندی ئابوری یان کۆمەڵایەتی یان شارستانی چ وەکو دەسەڵاتی ئیداری سیاسی چ وەکو دەسەڵاتی ئایینی. بە واتایەکی تر گەشەی (سروشتی) دەسەڵات بە پێی بوونی ئەو ناوەندە بەرهەم دەهێنرێ و لەوێشەوە ئاراستەی فەرمان دەکرێت بۆ دەوروبەرو کەنار، دەوروبەرو کەناریش بەشێوەیەکی دیسپلین کراو دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی ئەو دەسەڵاتەوەو پێوەی

دەبەسترێت، بەڵام لە کوردستاندا لەبەر دروستنەبوونی شارەکان لە ناوەنداو لەبەر نیشتەجێ بوونی دانیشوان لە سنوورەکاندا دامودەزگای بەڕێوەبردن و بەوپێیەش دامودەزگای دەسەڵات لە هێڵی سنووریدا دروستبووە نەك لە ناوەندا، دەشێ ئەو پرسیارە سەرهەڵبدات و بڵێت ئەی خۆ گەلێك لە وڵاتانی دی ناوەندی سەرەکی و دەسەڵاتی ئیداری و پایتەختیان لە سنوورەکاندایە کەواتە بۆچی ئەو وڵاتانە یان کۆمەڵگایانە گەشەی سروشتیان نەشێواوە؟ ئەم قسەیە راستە بەڵام ئەو کۆمەڵگایانە رەنگە جگە لە شێوازی دابەشبوونی دانیشتوان بەپێی ناوچەی بەرهەم هێنان گرفتی تری کۆمەڵایەتی و کەلتوریان نەبووبێت و بەر پرۆسەی داگیرکردن نەکەوتبن و لەلایەکی تریشەوە زۆربەی زۆری ئەو ناوەندانەی ئابوری و دەسەڵات کە لە وڵاتانی تردا دروستبوون و کەوتوونەتە ناوچە سنووریەکانەوە، لەسەر سنوورەکانی ئاو واتە لەسەر دەریاو ئۆقیانووسەکان دروستبوون. بەڵام بە پێچەوانەی ئەو وڵاتانەوە کە ناوەند لەسەر سنووره ئاوییەکانیان دروستبووە کوردستان یەکێکە لەو وڵاتە بە ژمارە هەرە کەمانەی کە هیچ سنوورێکی لەسەر دەریا نیە ئەگینا ئەگەر یەکێك لە سنورەکانی کوردستان لەسەر دەریا بوایە ئەوا حاڵەتێکی زۆر سروشتی و بگرە پایەیەکی بەهێزیش دەبوو بۆ کوردستان کە ناوەندی دەسەڵات و ئابوری و سیاسی لەسەر سنووری ئاوی بوایە چونکە سنوری ئاوی مانای بوونی دەروازەیەکی هەمیشەکراوە بەسەر جیهاندا. کە لەم رووەوە کوردستان وڵاتێکی داخراوو خنکاوە.

دروستبوونی زۆربەی شارەکانی کوردستان لە نزیك سنوورەکان، ئەوە دەگەیەنێت کە بە پێی باری چڕی دیمۆگرافی لە سنوورەکاندا، دامودەزگا کۆمەڵایەتیەکانی بەڕێوەبردن و سەرەتای دامودەزگای کۆمەڵگای شار لە کوردستاندا کەوتوونەتە نزیك سنورەکانی بێگانەوەو لەبری ناوەند لە کەناردا دروستبوون. واتە ئەوەی پێی دەوترێت

نـاوەندی دەسـەڵاتی بەرهـەم هێـن لـە کوردسـتاندا لـە پشـتێنە سنوورییەکاندا دامـەزراوەو بەکاریگـەری دەرەوەش دروستبووە کـە لـە مێژووی کۆندا بریتین لە شارستانی میزۆپۆتامیاو گریك و رۆم و فارس، لە مێژووی نوێشدا دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە دەوری هەبووە لەو روانگەیەوە ئەویش بەکاریگەری راکێشـانی ئـابوری کوردسـتان بـەرەو نـاوەندو پایتەختـەکانی خۆیـان بەوەش هێزی راکێشان بەرەو ناوەندی کوردستان شکستی خواردووەو هـێزی راکێشـان بـەرەو سـنورەکان و دەرەوەی کوردسـتان سـەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

هەڵبەت ئەوە ئاشکرایە کە هەر دەسەڵاتێك خاوەنی ناوەندێکی بەهێز نەبێت وەکو چەقێکی بەهێزی بەرهـەم هێـن و لـە نـاوەندەوە کۆنتـرۆڵی کەنار نەکات بەهەموو ئاراستەیەك و سـەرجەم کەناریش لـەژێر فـەرمان و ئاراستەکردنی ناوەندا نەجوڵێت ئەوە ئەو دەسەڵاتە کەسێتێکی لاوازی دەبێـت و روخاندنیشـی گـەلێك ئاسـان دەبێـت بەتایبـەتی کاتـێ درێژکراوەیـەکی بـێ هـێز بێـت بـە درێژایـی سـنوورەکانی وڵاتـدا ناوەندەکەشی بریتی بێت لە بۆشایی لەرووی دەسـەڵاتەوە، ئەوا بڕینـی ئەو سنوورەو روخاندنی گەلێك ئاسانە ئەگەر لە پشتییەوە هێزی پتەوی ناوەند نەبێت، بۆ نموونە ئەگەر لە کوردستاندا لە هەر کام لـە دەوڵـەتانی دراوسـێوە هـێرش بـۆ کوردسـتان بکرێـت ئـەوا راسـتەوخۆ شـارەکان دەکەونـە بـەر ئـەو هێرشـە، لـە پشـتی شارەکانیشـەوە بۆشـاییەکی دیمۆگرافی و بەرپێیەش نەبوونی هێز هەیە، بەگوێرەی کوردستان ئەگەر هەر هێزێکی دەرەکی پشتێنەی سنووری بۆ ماوەی چەند میلێك بڕی ئەوا مانای وایە هێڵی بەرگری شکاندووەو گەیشتۆتە ناوەندی لاوازو نیمچە بۆشـاییەوەو دەتوانێـت بـەرەو نـاوەند بکشـێت کـە نـاوەندیش لـە رووی هێزو دەسـەڵاتەوە لاوازەو ئەگـەر پشـت بـەخۆی ببەسـتێت توانـای هیـچ بەرگریەکی نیە، خۆ ئەگەر لە شێوازی جەنگی پارتیزانیدا ناوەند لەبەر

ئەوەی وەکو قەلایەکی سەختی سەربازی وەھایە خۆی بپارێزێت، ئەوا ئەو خۆپارستنە دوای تێکشکاندنی پشتێنەی ناوەدانی سنوورەکانی کوردستان گرنگییەکی ئەوتۆی نابێت.

دەتوانین لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەو بزوتنەوە چەکدارییانەی لە بەشەکانی کوردستاندا سەریان ھەڵداوە، کاتێ فشاری زۆری داگیرکەرانیان بۆ ھاتووە لە سنووری ھاوبەشی سێ دەوڵەتی داگیرکەری کوردستاندا جێگای خۆپاراستنیان بۆ فەراھەم بووە کە ئەو ناوچەیەش زیاتر دەکەوێتە ناوەندی کوردستانەوەو ناوچەیەکی سەخت و یاخیە، لێرەشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کاتێ کورد لە حاڵەتی ئاسایی ژیاندا بووبێت و پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەردا ئاسایی بووبێت لەلایەك لەباربوونی سنوری گشتی کوردستان بۆ نیشتەجێ بوون ھانیداوە لە پشتێنەی سنووردا نیشتەجێ بێت، لەلایەکی تریشەوە ھێزی راکێشانی دەوڵەتانی دەوروبەر وەکو ناوەندی بەھێز توانیویانە ھێزی ئابوری و مرۆیی کورد بەرەو لای خۆیان رابکێشن و لەو ئاقارەشدا نیشتەجێ بوون لە سنوورەکانداو لەنزیك دەوڵەتانی دراوسێوە دروستبووە، ھەرکاتێکیش کورد مەترسی و فشاری ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بووبێت واتە لە حاڵەتی نائاسایی ژیانیدا پەنای بردۆتەوە بەر ناوەندی سەختی کوردستان بۆ ئەوەی خۆی تێدا بپارێزێت، کە ئەوەش خاسێتی جۆرێك لە خۆحەشاردانی دروستکردووە. بێگومان ھەر ئەم حاڵەتانەش ئەو بۆچوونەی دروستکردووە کە پشت و پەنای کوردەکان تەنیا چیاکانن و. کوردەکان دۆستیان نیە جگە لە چیاکان(٣٣) کە دەتوانین بڵێین ئەگەر ئەو چیایانە نەبوونایەو کوردستان جۆرە تۆپۆگرافیایەکی تری ھەبوایە دەشیا کۆمەڵگای کوردی جۆرە پەرەسەندنێکی تر ھەبوایەو رەنگە زەمینەی دابەشکردنی کوردستانیش لەنێوان دەوڵەتانی ناوچەکەدا وا بەئاسانی نەرەخسایە.

سروشـــتی دابەشـــبوونی دانیشـــتوان و دروســـتبوونی شـــارەکانی کوردستان لـە پشـتێنە سـنووریەکانداو بوونـی شـارەکانیش بـە پنتـی دەسـەڵات و بـەڕێوەبردن لـە مێـژووی کۆنـدا بۆتـە هـۆی دروسـتبوونی پەیوەندی ئاڵوگۆڕکردنی بەربلاو لەنێوان کوردستان و دراوسێکانیدا لـە رووی ئابوورییەوە. کە ئەمـەش ڕێگای خۆشکردووە بۆ ئـەوەی بەرهـەمی ئـابوری لـە کوردسـتانەوە بـە ئاسـایی بگوازرێتـەوە بـۆ دەوڵـەتانی دەوروپشتی. ئەمەش هاوشێوەی ئەوەیە کە چۆن گەشەی ئاسایی لـە کوردستاندا بواری دروستبوونی بـۆرژوای پیشەسـازی لـەباربردووەو شێواندووە، بەهەمان شێوە ئـەو ئاڵوگۆڕەی پـەیوەندیش فاکتـەرێکی تر بووە بۆ ئەوەی کورد ئەو بەرهەمانەی لەخۆی زیادە بەتایبـەتی بەرهـەمی ئاژەڵداری بگۆڕێتەوە بە پێداویستی‌یە سەرەتاییەکانی نیشتەجێ بوون و ژیانی نێو شاری سادەو گوندی ئەوساو ئامێرو ئامرازە تەکنیکی‌یـە سادەو ساکارەکانی کشتوکاڵ و ئاودێری. ئەمەش وایکردووە تەنانـەت لە شارە دروستبووەکانی کوردستانیشدا کـەمتر دیاردەی پیشەسـازی سـەرهەڵبدات و تـا مێژوویـەکی درەنگیـش تەنانـەت مانیفاکتۆریـا بەشێوەیەکی لەبـەرچاو دروست نـەبێت. ئەمـەش وایکـردووە بـۆرژوای پیشەیی لە کوردستاندا بە سروشتی درەنگەوێت. دیسان لەبەرنەبوونی نـاوەندی دەسـەڵاتی ئـابوری و بـەڕێوەبردن لـە نێوەنـدی کوردسـتانداو داخورانـی جوگرافیـای کوردسـتان بـە ئاراسـتەی دەرەوەو بوونـی دەوڵەتانی خـاوەن شارستانیش لـە سـنوورەکانی دەرەوەی کوردسـتان بۆتـە هـۆی ئـەوەی کـە جوگرافیـای کوردسـتان وەکـو بۆشـاییەك خـۆی نیشـانی دەرەوە بـدات لـە بـەردەم ئـەو دەوڵـەت و شارسـتانیانەی دەوربەریدا ئەم جوگرافیایەکی بێناسنامە واتە بێ خاوەن بووە، ئەوەش وەهـای کـردووە دەسـەڵاتانەی دەوروبـەری کوردسـتان کاریگـەرییان سـنوورەکانی کوردسـتان بـبڕێت و لـەرووی دەسـەڵاتی مەعنەوییـەوە

پشتێنەی سنوری کوردستان کە زۆربەی دانیشتوانی تێدا نیشتەجێ بووە بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی ئەو دەوڵەت و شارستانێتانەی دەوروبەری.

دیسان لەبەر پێشکەوتن و گەشەی ئابوری و ئیداری و کەلتوری و بەوپێیەش پەرەسەندنی دامودەزگاکانی بەڕێوەبردن لە وڵاتانی هاوسنووری کوردستاندا، ئەو وڵاتانە کەوتوونەتە ڕاکێشانی سامانی ئابوری کوردستان و بەرەو ناوەندی فەرمان و دەسەڵاتی خۆیان کێشیان کردووە. واتە کوردستان کەوتۆتە نێوان ڕاکێشانی هێزی باڵای دراوسێکانی و لە ناوەندی خۆیشیەوە هێزی لاوازی ڕاکێشان بەرەو چەق پێگرتنی واتە بەرەو بەناوەندبوونی و بەو پێیەش بەرەو بە کوردستانی بوون لە تێکڕای بوارەکاندا هێندە لاواز بووە لە بەرامبەر هێزی ڕاکێشانی بەرەو دەرەوەدا هیچ ئامادەبوونێکی نەبووە. واتە ڕاکێشانی بەهێز بە ئاراستەی دەرەوە هێزی ڕاکێشای لاوازی بەرەو ناوەندی خۆیشی کە لە ئاستی نەبوودا بووە وەهای کردووە کە بڕی بەرەنجام بە ئاراستەی دەرەوە بێت، ئەوەش بۆتە یەکێك لە هۆیە سەرەکیەکانی دروست نەبوونی ناوەند لە کوردستاندا. ئەم حاڵەتە هاوشان لەگەڵ داخورانی تۆپۆگرافیای کوردستان بە ئاراستەی دەرەوە یارمەتی پوکاندنەوەی ماك و بنەمای بەرەو ناوەندی خۆو چەق بەستنی کوردستانی هەرەس پێهێناوە. ئەم ڕاکێشانەی بەرەو دەرەوە دەشێ بەهۆی سەرەکی لەبەر ڕۆیشتنی ئابوری دابنرێت. کە ئێمە لە بەشێکی تری ئەم کتێبەدا لەو باسە دواوین. بێگومان لەبەر ڕۆیشتنی ئابوری کوردستان بۆتە هۆی لەباربردن یان دواخستن و شێواندنی زەمینەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی. هەر ئەو لەبەرڕۆیشتنی ئابورییەش واتە ڕاکێشانی داهاتی ئابوری کوردستان لەلایەن دەوڵەتانی دەوروبەرەوە بۆتە هۆی هەرەس هێنانی بنەماکانی ژێرخانی کۆمەڵایەتی لە قۆناغێکی زوودا، ئەگەر ئەو لەبەرڕۆیشتنە نەبووایە دەشیا گەشەی ئابوری کوردستان جۆرێك لە سەربەخۆیی بوونی هەر لە سەرەتاوە وەربگرتایەو

بەرپێنیەش گەشەی سروشتی بنەمای ئابوری و پەیوەندی کۆمەڵایەتی خۆیی دروست بکردایەو لەسەر ئەو زەمینەیەش پۆلێن کردنی چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان بەخۆیان و فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیایانەوە بە ئەنجام بگەیشتنایە، یان هەر چین و توێژێکی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی سروشتی و بە سەرجەم خاسیێتەکانیەوە فۆرمەلە ببوایە.

کاتێ بنەمای ئابوری کوردستان دووچاری ئەو کەرت بوونە بووە لە نێوان دەسەڵاتە گەورەکانی هاوسنوریەوە و لەبەر نەبوونی ناوەندێکی دەسەڵات وەکو پنتی بەرهەم هێنەری ئەو دەسەڵاتەو خاوەن توانا بۆ کۆنترۆڵکردنی کاریگەری ئاشکرای ئەو بارە ناسروشتی‌یە لەسەر گەشەی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی مرۆڤی کورد چی تر ژێرخان نەبۆتە ماکی زیندوکردنەوەی کەسیەتی نەتەوەیی کوردی، هەر لێرەوە بە ئاشکرا کاریگەری نەبوونی ژێرخانێکی کۆمەڵایەتی پتەو لە مێژووی کوردستاندا دەردەکەوێت کە ئەویش دەرئەنجامی خودی ئەو جوگرافیایە لەوەیدا کە زەمینەیەکی باش و گونجاو نەبووە بۆ کشتوکاڵ کە یەکەمین هۆکاری نیشتەجی بون و سەرهەڵدانی دامودەزگای کۆمەڵگای نیشتەجێیە. لایەنی دووەم چەق بەستنی چیاکان بە ئاراستەی ناوەندی کوردستان و ئاراستەی داخوران بەرەو دەرەوە کە بۆتە هۆی دروستکردنی بۆشاییەکی دیمۆگرافی و ئابوری لە ناوەنداو ئەوەش لەلایەك لاوازی ناوەند نیشان دەدات بۆ بوونی بە ناوەندی دەسەڵات و بڕیارو راکێشانی دەوروبەری بەلای خۆیدا. ئەمە سەرباری ئەوەی لە بارنەبوونی تۆپۆگرافیای ناوەندی کوردستان بۆ بەرهەم هێنانی زۆرو پێویست دەوری بینیووە کە دانیشتوانی بە ژمارە کەمی ناوەند لە ئاستێکی دواکەوتووتردا بمێننەوە لەچاو سنورەکاندا چونکە ئەوە ئاشکرایە لە هەموو رووبەکەوە ئابوری دەوری کاریگەر دەبینێ لە رێکخستنی کۆمەڵایەتی و ئاراستەکردنی پەرەسەندندا، هەر ئەوەش وایکردووە ئەو پەرەسەندنە کۆمەڵایەتیەی کە لە پشتێنە سنووریەکاندا

روویداوه، زۆرجار هەندێ لە بنەماکانی ڕەسەنایەتی لەدەست داوە، ئەویش بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەری هێزو دەسەڵات و کەلتورەکانی دەوروبەرەوە کە ئەوان لە بنەڕەتدا لە هێز و دەسەڵات و کەلتوری کوردی بەهێزتر بوون، بێگومان ئەوەش بارێکی ئاساییە کە بێهێز بکەوێتە ژێرکاریگەری بەهێزەوە.

ژێرخانی ئابوری پتەو دەبێتە هۆی فۆرمەلەبوونی چینی کۆمەڵایەتی خاوەن خەسڵەت و سیفاتی دیارو ئەو چینەش دەگاتە پلەی پێگەیشتنی خۆی، واتە لە مێژووی خۆیدا دەبێتە خاوەنی ئایدیۆلۆژیاو فەلسەفەو ئەخلاقی کۆمەڵایەتی خۆی، ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەرنجی کۆمەڵگای کوردەواری بدەین هەر لە مێژووی زانراوی ئەم کۆمەڵگایەوە تاکو ساتەوەختی ئێستا ژێرخانێکی ئابوری پتەوی نەبووە، بگرە بە پێچەوانەوە ژێرخانێکی لاوازی هەبووەو لەزۆر قۆناغی مێژوویدا ژیان گەیشتۆتە ئاستی مەترسی و قات و قڕی بەتایبەتی لەبەر ئەوەی سەرچاوەی ژیان ئاژەڵداری و ئەو کشتوکاڵە کەمە بووە کە کراوە. زیاتریش چ بۆ لەوەڕگاو چ بۆ کشتوکاڵیش پشت بە باران بەستراوە کە ئەم حاڵەتە تاکو ئێستاش بەردەوامە. خۆ ئەگەر ساڵێك باران کەم بووبێت ئەوا چ لەوەڕگاکان و چ کشتوکاڵیش دووچاری قەیران و شکست بوون و بەوەش کاریگەرییەکی خراپیان لەسەر ژیانی ئابوری خەڵك هەبووەو هەر ئەوەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە زیاتر کوردی کردۆتە مرۆڤی قەدەری و ئیرادەی لێ سەندۆتەوە. لەبەر ئەو لاوازی باری ئابورییە چینە کۆمەڵایەتیەکان وەکو ئەوەی پێویستە بەشێوەیەکی سروشتی دروست نەبوون.

مێژووی قۆناغی کۆیلایەتی لە کوردستان مێژوویەکی نائاشکراو نەزانراوە، بەڵام کاتێ لەسەر نیشتەجێبوون و گرنگیدان بە کشتوکاڵ قسە دەکرێ ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی لێدوان لەسەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی فیودیالی دەبینەوە. یەکەمین هۆکارێکی گرنگ بۆ قسەکردن لەسەر ئەو

پەیوەندییە بەندە بە زەوی و خاوەندارێتی زەوییەوە. کاتێ باری تۆپۆگرافی کوردستان نالەبار بێت بۆ کشتوکاڵ و ئاودێری، مانای وایە خودی ئەو پەیوەندییە لە بنەڕەتدا لاواز بووە. کاتێ زەوی کشتوکاڵی لە زۆربەی زۆری ناوچەکانی کوردستاندا نەبووبێت ئیتر چۆن پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی بەهێزی فیودیالی دروستبووە، بەتایبەتی لە ناوەندی کوردستانەوە بە ئاراستەی باکورو باکوری رۆژهەڵات و باکوری رۆژئاواش. دیارە باسی ئەم چەند ساڵەی دوایی ناکەین کە چەندین بەنداوو جۆگاو بناوان دروستکراون بە مەبەستی برەودان بە کشتوکاڵ و ئاوێردی و سەرباری سروشتی نالەباری باری تۆپۆگرافیای کوردستان بۆ ئاودێری لەو روانگەوە کە ئاستی چەم و رووبارەکان بەرێژەیەکی زیاتر لە ئاستێکی هێجگار نزمدان لەچاو زەوی‌یە کشتوکاڵیەکاندا بەلام لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێکی سادە لە میکانیزەکردنی کشتوکاڵ کاری بۆ کراوە. کاتێ زەوی کشتوکاڵی کەم بووبێت و خەڵکی زیاتر پشتیان بە ئاژەڵداری بەستبێت بۆ دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی ژیان کەواتە نە خاوەندارێتی زەوی هێندە پەرەسەندو بووە نە جوتیاریش خەسڵەت و سیفاتی چینایەتی خۆیی هەڵگرتووە. دیارە جیاوازی رێژەی زەوی لەبار بۆ کشتوکاڵ لەنێوان چیاکان و ناوچە سنووریەکاندا بەتایبەتی لە باشورو رۆژهەلات و رۆژئاوای کوردستاندا، یان لە نێوان ناوەندو سنوورەکاندا دەورێکی کاریگەری هەبووە لەسەر شێوازی دابەشوبوون و جیاوازی چڕی دانیشتوان، کە لە سنوورەکاندا لەبەر نەبوونی زەوی لەباری زیاتر بۆ کشتوکاڵ و کاریگەری زیاتری دەرەوەش لەسەر سنوورەکان ئاستی بەرهەم هێنان و ئابووریش لە سنورەکاندا پەرەسەندوتر بووە لەچاو ناوەندا. هەڵبەت ئەم هۆکارە ئابوورییەش لە ناوچە سنووری‌و دەشتی‌یەکاندا کاری لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کردووە. لەم بارەیەوە دێرك کەنانە دەڵێت: کوردی چیاکان، ئاغاو مسکێن لە هەمان بنەماڵەی گەورەی خێڵەکین، بەلام لە دەشت و بانەکاندا

ئەو پەیوەست بوونە کەمتر شقلی خێڵایەتی هەیەو زیاتر پەیوەندی فیودیالیە لەکاتێکدا ئاغاو مسکێن لە هەمان بنەماڵە نین(٣٥).

لێرەوە ئەوە ئاشکرا دەبێت کە ژێرخانی ئابوری لە دەشت و بانەکاندا لەبەرئەوەی کشتوکاڵ سەرچاوەی ژیان بووە پەرەسەندووتر بووە سەرباری ئاسروشتی گەشەی کۆمەڵایەتی لە بنەڕەتەوە، لەبەرئەوەی کشتوکاڵ کردن بەرهەم هێنانی قۆناغێکی پەرەسەندوترە لە شوانکارەیی و ئاژەڵداری بۆیە توانیوویەتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە سنووری تەسکی بنەماڵەیەکەوە بگوازێتەوە بۆ ئاستی پەیوەندی فیودیالی ئەگەرچی ئەو پەیوەندییە فیودیالیە زۆر لە خەسڵەت و سیفاتە کۆمەڵایەتیەکانی بەرجەستە نەبوون. کاتێ کە ژێرخانی کۆمەڵایەتی دەکەینە بنەما بۆ دیاریکردنی گەشەی کۆمەڵایەتی واتە دەبێ بزانین کە ناشێت ژێرخانێکی لاواز چینێکی کۆمەڵایەتی کامڵ و خاوەن ئایدیۆلۆژیاو فەلسەفەی کامڵی چینایەتی دروست بکات. کاتێ لە کوردستاندا لە بنەڕەتەوە ژێرخانی کۆمەڵایەتی ژێرخانێکی لاواز بووبێت، هەڵبەت بەوپێیەش پێکهاتەی کۆمەڵایەتیش بەهەمان شێوەیە واتە سەرجەم چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان بە ئیفلیجی و ناتەواوی دروستبوون و پێکهاتوون و ئەو بارە ناسروشتییەی ژێرخانی ئابوری و شێوازی تێکەڵ و پێکەڵی کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتیش هەبووەو لەو شێوە ناسروشتییەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا خۆی بینیووەتەوە کە تێکڕا چین و توێژەکان بە جۆرێک بەنێو یەکدا چوون کە سەرجەم خەسڵەت و فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیای چینایەتی خۆیشیان بۆ بەرجەستە نەکراوە. باری ئاڵۆزی لێکدانەوەو توێژینەوەی بنیادی کۆمەڵایەتی کوردی و مێژووی گەشەو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایە لێرەوە دەست پێدەکات کە مایەی نیگەرانی و بەڵگەی کەمتەرخەمی و تێنەگەیشتنیشە کە بابەتێکی وەها گرنگ تاکو ئێستا بەشێوەیەکی لەبەرچاو نەبۆتە پرسیار لە پانتایی

سیۆسیۆرۆشـنبیری کوردیـداو تەنانـەت مێـژووی سیاسـیش لـە کوردسـتاندا لـەوە کـەم تواناتر بـووە کـە پـەی بـەو مەسـەلە ببـات، چ مارکسیەکان و چ ئەوانەشی کە خۆیان بە نەتەوەیی زانیووە هەریەکە لە تیشکە نیگایـەکی خەیالاوییـەوە لـە مەسـەلەکەیان روانیـووە، چونکـە سەرباری تێروانینی جیاواز هیچ کام لە هەڵگرانی ئـەو بۆچوونانـە لـە بنیادی پێکهێنەرانەی کۆمەڵگای کوردی نەگەیشتوون و وای بۆچوون کە رەوتی مێژوو یەك هێڵی راستەو چۆن لە ماتریالیزمی مێژوودا هـاتووە هـەموو کۆمەڵگایەك با جیاوازیشی هـەبێت لە بنیـادی پێکهێنەرانـەیاندا بەلام هەمان شێوەی گەشەکردنیان هەیە.

سروشـتی جوگرافیـای کوردسـتان لـە رووی هەسـت و نەسـتەوە کاریگەری زۆری لە پێکهاتنی باری هوشیاری کورد کردووە. بە تێکڕا کـورد جۆرێـك لـە شـانازی کردنـی بـەو جوگرافیـاو بـە چیاکانـەوە لا دروستبووە لەبەرئەوەی جوگرافیایـەکی ئالۆز و پڕ لە چیای سەخت و یاخیی و ئالۆزەو ئەمیش لەکاتی پێویستدا خۆیـی تیا حەشار دەدات. ئـەوەش لـەبری بەرهـەم هێنـانی هەسـتی خوانوانـدن و خۆناسـاندن بـە دەرەوە لای مـرۆڤ کـورد، هەسـتی خۆدورخسـتنەوەو خـۆ حەشـاردانی لادروست کـردووە، ئەمـەش یەکێکە لـەو هۆکارانـەی کـە کوردیـان وەکـو کۆمەڵگایەکی نێو سروشت هێشتۆتەوە. مرۆڤی کوردیش لەبری هەوڵدان بـۆ هاتنـە نێـو مێـژوو، شارسـتانیەت گۆشـەگیری و دوورکەوتنـەوەی هەڵبژاردووەو بۆ ئەو مەبەستەش چیاکان چاکترین زەمینەیەك بوون کە خۆیان تیادا حەشار بدات.

تاکو ئێستا ئەگەر سەرنج بدەیـن دەبینـین کـە پێکهاتـەی جوگرافیـاو تۆپۆگرافیای کوردستان کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر دواخستنی گەشەی سروشتی پەیوەندی بەرهەم هێنان هەبووە. هەر ئەو کاریگەرییە جێکەوتی خۆی لەسەر گەشـەی کۆمەلایـەتی دیـاری کـردووەو ئـابوری (ژێرخـانی دواکەوتوو) نەبۆتە ماکی پێکـهێنانی چینـە کۆمەلایەتیـەکان

بەشێوەیەکی تەواو. هەر بەو پێیەش گەشەی چین و توێژەکان بە ئەندازەی پێکداچوون و بەناویەکدا کشانی چیاکانی کوردستان پێکداچوون و لەنێو یەکدا تێکەڵاوبوون، تا ئەو ئاستەی کە سیفات و خەسڵەتی سەرەکی خۆیشیانیان لە دەست داوە یان هەر لە بنەڕەتەوە ئەو سیفات و خەسڵەتە چینایەتیەیان بەدەست نەهێناوە. ئەوە سەرباری لەبەرپرژیشتنی ئابوری کە وەکو باسمان کرد چۆن جەستەی جوگرافی و کۆمەڵایەتی کوردستانی کردۆتە جەستەیەکی بێگیان لەو روانگەوە کە رۆحی ئابوری ئەم وڵاتە لەو پرۆسەیەدا لەلایەن وڵاتانی دەوروبەرەوە راکێشراوە و لە جەستەی کورد دەرمێنراوە. واتە هەرچی گەوهەرو ماکی دروستبوون و پێکهاتنی کۆمەڵایەتی کوردیە مژراوەو ئەوەش بۆتە هۆی ئیفلیج کردن و بە ساوایی مانەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کوردی.

نەبوونی ژێرخانی کۆمەڵایەتی پتەو بۆتە مایەی پەرەوازەیی و دابرانی خێڵ و تیرەو عەشیرەتەکانی کوردستان لە یەکتری چونکە لاوازی ئەو ژێرخانە بۆتە فاکتەرێك کە دامودەزگای گشتی کە توانای کۆنترۆڵکردنی کوردستانی هەبێت دروست نەبێت. هەروەك دواکەوتنی دروستبوونی چینە کۆمەڵایەتیەکانیش بەهەموو خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکانیانەوە بۆتە مایەی شێواندنی کێشەی چینایەتی و بەوپێیەش بزوێنەری مێژووش لە کۆمەڵگای کوردیدا شێواوەو ناکرێت لە دیدوبۆچوونی مارکسیانەوە بۆی بروانرێت و بە هۆکاری ئابوری و ململانێی چینایەتی دابنرێت، هەروەك بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا هەرچۆن فاکتەری ئابوری نیە بە تەنیا هەروەها بەتەنیا خوێن و دەمارگیریش نیە(٣٦) بەڵکو دەشێ بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا لە یەکگرتنەوەی هەموو ئەو هۆکارانە پێك بێت کە دەوریان دەبێت لە جوڵاندنی کۆمەڵی پەرتبووی کوردیدا بە ئاراستەی یەکگرتنەوەو یەکبوون و یەکێتی دروستکردن لە سنووری گشتی نەتەوەدا.

وەك گوتمان ئەو بارە ئابوورییە شێواوە کە نەیتوانیووە پێکهاتنی کۆمەڵایەتی بە سروشتی بەرجەستە بکات کاریگەری لەسەر دواکەوتنی دروستبوونی هەستی نەوتەوایەتی کوردی هەبووە، ئەگەرچی هەستی نەتەوایەتی کوردی لە دوا چارەکی سەدەی نۆزدەدا بە ئاشکرا دەرکەوتووەو نموونەی دیاری ئەو دەرکەوتنەش لە راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری‌دا ئاشکرا دەبێت و دواتریش دەرکردنی یەکەم رۆژنامەی کوردی لە دوا ساڵەکانی ئەو سەدەیەدا بەڵگەی زیندووی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەییە.

بەڵام لە روانگەی روانین بۆ پەیوەستکردنەوەی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی بەدەرکەوتنی چینی بۆرژواوە، ئەوا ناسروشتی گەشەی ئابوری بەکاریگەری ناسروشتی بوونی تۆپۆگرافیای کوردستان لە دوو رووەوە رۆڵی هەبووە لە دواخستنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و دەرکەوتنی هەست و هوشیاری نەتەوایەتدا. یەکەمیان بریتی‌یە لە لاوازی خودی ئەو ژێرخانە کۆمەڵایەتییە کە نەیتوانیووە زەمینەی پێکهێنانی سەرخانێکی کۆمەڵایەتی پتەوو بەهێز بڕەخسێنێ کە هەست و هوشیاری نەتەوەیی دەکەونە ئەو پانتاییەوە، هەڵبەت مەبەست لەم قسەیەش ئەوە نیە کە سەرخان رەنگدانەوەیەکی میکانیکیانەی ژێرخانی ئابوری‌یەو هەتا ژێرخان کامڵ نەبێت ئیتر رەگەزەکانی هەست و هوشیار نەتەوەیی دەرناکەون، نەخێر ئەو رەگەزانە دەردەکەون بەڵام ئەگەر سیستەمێکی ئابوری یەکگرتوو بوونی نەبێت ئەوا هەستی نەتەوایەتیش بەشێوەیەکی یەکگرتوو دەرناکەوێت بەڵکو بەشێوەیی پچڕپچڕ و ناوچەیی دەبێت و زۆرجار دەبێت بە هاوشێوەی هەرێمگیری و سنووردارێتی خێڵایەتی لە کاتێکدا هەستی نەتەوایەتی دەبێ هەموو جەستەی نەتەوە بگرێتەوەو هەموو سنوورەکانی نێوان بەشەکانی نەتەوە یان کۆمەڵ هەڵبووەشێنێتەوە.

دووەمیان لەبەرئەوەی بۆرژوای کوردی وەکو چینێکی کۆمەڵایەتی لە ئەنجامی لاوازی ژێرخانی ئابوری کوردستان و کاریگەریەکانی داگیرکردنی بەردەوامدا وەکو چینێکی کامڵی کۆمەڵایەتی دروست نەبووەو بۆرژوایەکی سروشتی نەبووە لە ئەنجامی گەشەی ئاسایی مێژوویی و لە هەناوی قۆناغی فیودیالیدا دروست بووبێت و خاوەنی کەسێتی کۆمەڵایەتی بێت و لە گەوهەریدا داواکارییە دیموکراتیەکانی نەتەوەی هەڵگرتبێت و بەوپێیەش دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی بە ئەرکی خۆی بزانێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆرژوایەکی ناتەواوە لە رووی خەسڵەتی چینایەتیەوەو زیاتر بە کاریگەری دەرەوە دروستبووەو لەبری هەڵگرتنی دروشمی گۆڕانکاری جۆرێك لە خۆپارێزی پەیڕەو دەکات و سیمایەکی مشەخۆرانەو قاچاخچیانەی هەیە چونکە لەسەر بنەمای گەشەیەکی سروشتی دروستنەبووە. ئەم حاڵەتەش رۆحی شۆڕشگێڕێتی کوشتووە بەو مانایەی کە ئامانجی گەیاندنی نەتەوە بێت بە رۆحی رەها کۆمەڵگا کە لە روانینی هیگڵەوە مەبەست لە رۆحی رەهای کۆمەڵگا گەیشتنەبە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت، ئەگەرچی مەرج نیە مەبەست دەوڵەتی ئیتنیکی بێت بەو ئەندازەی مەبەستی دەوڵەتە بۆ کۆمەڵگا وەکو ئاستێکی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کە دەشێ بەمەی دواییان بگوترێت دەوڵەتی نەتەوە یان دەوڵەتی گەل. بەلام لە کوردستاندا نە دەوڵەتی ئیتنیکی کوردی دروستبووە نە دەوڵەتی گەلی کوردستان واتە لەگەڵ کەمایەتیە ئیتنیکییەکانی تردا.

تاکو ئێستا یەکێك لە هۆکارە ناوخۆییەکان کە دەوری سەرەکیان هەبووە لە نەگەیشتنی کورد بە ئاستی دەوڵەتدا نەبوونی سیماو بنەماکانی یەکێتی و یەکبوونە کە لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا دامەزراوەکانی خێڵ و عەشیرەت وەکو دامەزراوی کۆمەڵایەتی سنووورداری ناوچەیی بەجۆرێك راهاتوون کە بوون بە خاوەنی ستراتیژێك کە ستراتیژی ژیانە لە سنوورێکی تەسك و دیاری کراوداو لەژێر سایەی

دەسەڵاتی ناوخۆدا کە ئەوەش بنەمای یەکگرتنەوەو یەکبوونی لاواز کردووە چونکە لەو سنوورە تەسکەی دەسەڵاتی خێڵدا سەرخێڵ خۆی دەسەڵاتداری یەکەمە بەلام لە یەکگرتنەوەدا بێگومان ئەو دەسەڵاتە لەدەست دەدات و دەبێ مل کەچی دەسەڵاتی نەتەوەیی و دیسپلینی کۆمەڵایەتی بێت لەسەر ئاستی هەموو کۆمەڵگا.

دیارە ئەوەشمان باس کرد کە خێڵایەتی کوردی لەبەرئەوەی کە خێڵایەتیەکی ناسروشتی بووە توانای دروستکردنی فیدراسیۆن لە نێوان خێڵەکاندا نەبووە، ئەگینا دەشیا کورد دەوڵەتی خێڵایەتی لە قۆناغێکدا بۆ دروست ببوایە، بەلام ئەوەش رووی نەداوە، هەر بۆیە عەقڵ و ستراتیژی بالادەست لە کوردستاندا لەوساوە سەرباری هەندێ سیمای وەرگیراوی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان یان روکەشی کۆمەڵگای مەدەنیو عەقڵ و ستراتیژی خێڵایەتیە. هەڵبەت ئەمەش بەکەم سەیرکردنی کۆمەڵگا ناگەیەنێت بەو ئەندازەی کە دیاری کردنی بنەماکانی پێکهاتنی ئەم کۆمەڵگایەو سروشتی پەرەسەندن و سەرهەڵدانی هەست و هوشیاری نەتەوەییە، شان بە شانی ئاخاوتن لەسەر لایەنە لاوازەکان و لایەنە بەهێزەکان لە بوونی کۆمەڵایەتی ئێمەدا. بێگومان عەقڵ و ستراتیژی خێڵایەتی لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کوردیدا پانتاییەکی فراوانی داگیرکردووەو تەنانەت (تاکە) شوێن کەوتووەکانی سیمای شارستانی و کۆمەڵگای مەدەنیش تەنها لەکاتی ئاسایدا دەتوانن بەو رووکەشە خۆیان حەشار بدەن، ئەگینا لەهەموو بارێکی شلۆق و کاتێکی نائاسایدا دەگەرێنەوە بۆ سەر ئەسڵی خۆیان واتە بۆ مومارەسەکردنی هەمان عەقڵیەت کە عەقڵیەتی خێڵایەتیە. من پێم وایە کۆمەڵگای کوردی هەتا نەگات بە ئاستێکی تری پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و هەتا گیانی یەکگرتنەوەو یەکبوون کۆنترۆڵی هەموو کۆمەڵگا نەکات و هەموو سنوورەکانی خێڵایەتی هەڵنەوەشێنێتەوەو بەوپێیەش شوێنەواری نێگەتیڤی تۆپۆگرافیا لەسەر دابەشبوونی خێڵەکان و دابەشبوونی

دیموگرافی نەسڕێتەوە، ناشێت زەمینەی گونجاو بۆ بوژاندنەوەی نەتەوەیی بڕەخسێ و هەر بەوپێیەش کۆمەڵگای کوردی لەڕووی پەرەسەندنی کۆمەلایەتیەوە هەنگاوی دیاری بەرەو بەدەوڵەتبوون و بەوپێیەش هەنگاوی بەرەو بە مەدەنی بوون هەڵبنێت.

ئێستا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە مێژووی گەشەی کۆمەلایەتی لەکوردستاندا ڕێگایەکی سروشتی لەبەر نەگرتووەو دووچاری شێواندن و لادان هاتووە، ئەویش لەژێر کاریگەری چەندین هۆکاردا کە یەکێك لە گرنگترینی ئەو هۆکارانە بریتی‌یە لە نالەباری تۆپۆگرافیای کوردستان، کە ئەم هۆکارە هەر لە قۆناغی نیشتەجێ بوونەوە دەورێکی ئاشکرای هەبووە لە شێوازی نیشتەجێ بوون لە کوردستان و بەتایبەتیش بووەتە هۆی ئەوەی کە هەر خێڵ و عەشیرەتێکی کوردی بەسەر چەندین ناوچەی دوور لە یەکدا پەرت و بلاوبکاتەوەو هەر ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی دابڕاوو ناپەیوەست و دوور لەوانی تر ژیان بەسەر ببەن، ئەوەش مرۆڤی کوردی لەسەر ژیانی پەڕەوازەیی‌و تەنیایی و گۆشەگیری ڕاهێناوەو ئاسۆی بینینی تەسك کردۆتەوەو لە یەکگرتن و یەکێتی و یەکبوون دووری خستۆتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم تۆپۆگرافیا نالەبارە لە ڕووی ئابورییەوە جۆرێك لە قایل بوون بە بەشی خۆ (الاکتفاء الذاتي) دروستکردووەو هەموو ئەمانەش دەوریان هەبووە لەوەدا کە بنەمای ئابوری بەهێز لە کوردستاندا پێك نەیەت، یان پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی بەجۆرێك لەباری سروشتی خۆی لایداوە کە نەیتوانیووە لە قۆناغی فیودیالیدا فیدراسیۆنی نێوان خێڵەکان پێکبهێنێت و لەو قۆناغەدا زەمینەی جۆرێك لە یەکبوون بڕەخسایە، کە دەشیا بۆ قۆناغەکانی دواتر لەسەر زەمینەی بوونی ئەو یەکێتی و یەکبوونە کۆمەڵگای پەرت و دابەشبووی کوردی بە تەواوی وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو پێکەوە هەموو خێڵ و عەشیرەتەکانی و هەموو چین و توێژەکانی بەهێزی مەعنەوی پتەو پێکەوە ببەسترایە کە ئەویش هێزی

مەعنـــەوی هەســـتکردن بـــە هاورەگـــەزی و هاوبـــەرژەوە ندێتـــی و هاوچارەنووسیە، کە ئەو هەستکردنەش تەنیا کاتێ سەرهەڵدەدات کـە هەستی نەتەوایەتی بەجۆرێك پەرەی سەندبێت بەسەر سنووری خێڵدا تێپەڕی کردبێ و بنەمای عەقڵ و ستراتیژی نەتەوەیی لە شوێنی عەقڵ و ستراتیژی خێڵـدا کاربکـات، ئـەوەش ئـەو قۆناغەیـە کـە زەمینـەی سەربەخۆیی و دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی بەرەو پێکهاتن دەچێت. کە بێگومـان سەرباری ئەو کەموکورتیانـەو سـەرباری ئەو بەربەستانە، مێژووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بەجۆرێك دەڕوات کە ئەو کۆرپەلـەی دەوڵەتـەی کە کۆمەڵگا لە هەناویدا هەڵیگرتووە لە دایك دەبێت، دیـارە کۆمەڵگای کوردەوایش هەر دەگـات بەئاستی لەدایکبوونی ئەو کۆرپەلە سەرباری بەربەست و کەموکورتیەکان.

سەرچاوەکان:


١-مینۆرسکی -کورد- وەرگێڕانی: حەمە سەعید حەمە کەریم -بەغدا- ١٩٨٤- ل٣٢.

2-Martin Van Brunssen. Agha. Shaikh and State- Zeedboohs- 1992- p –11.

٣-الدکتور محمد عابد الجابري -العصبية و الدولة -بغداد- دار الثقافة العامة - ص ٢٥٣.

٤-هەمان سەرچاوە/ ل ٢٦٤.

٥-عەتا قەرەداغی- لە عەقڵی شاخەوە بۆ ستراتیژی شار- رۆژنامەی نیشتمان. ژمارە (٢-٣)ی ساڵی ١٩٩٣.

٦-مطاع صفدي- استراتيجية التسمية -بغداد- دار الشؤون الثقافة العامة - ١٩٨٦- ص١٤١.

٧-عەبدوڵڵا عومەر - جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق - بابەتی بەرزی و نزمی رووی زەوی هەرێمی کوردستان - هەولێر- ١٩٩٩- ل٤٩.

٨-هەمان سەرچاوە- ل٨٤.

٩-الدكتور جمال رشيد احمد -دراسات كردية في بلاد سورباتو- بغداد- ١٩٨٤- ص ١٠٢.

١٠-هەمان سەرچاوە- ل ١٠٢.

١١-هەمان سەرچاوە- ل ١٠٢.

12-Henry field and E. J. R. The Kurdish Tribes The Anthropology of Iran and Iraq- p. 4.

١٣-أ- شاميلوف- حول مسألة الاقطاع بين الكرد- ت: الدكتور كمال مظهر احمد- الطبعة الثانية -بغداد- ١٩٨٤- ص ٤٢.

١٤-اشلي مونتاغيو- البدائية- ترجمة -محمد عصفور- كويت ١٩٨٢- ص ٢٩٥.

١٥-أ- شاميلوف- حول مسألة الاقطاع بين الكرد- ص ٣٦.

١٦-شەرەفخانی بەدلیسی -شەرەفنامە- وەرگێڕی هەژار- ل ٩٨.

17-Thomas Boiss- The Kurds- Tran- M. Welland- Beirut- 1966- p. 2.

18-Martin. Van Brunssin- Agha. P. 11.

١٩-عەلادین سەجادی - مێژووی ئەدەبی کوردی- بەغداد- ١٩٥٢- ل ٤٦٩.

٢٠-زينفون -مسيرة العشره الاف عبر كردستان- ترجمة: المهندس صلاح سعدالله- بغداد- ١٩٧٣- ص ٣٤.

21-Georges Roux- Ancient Iraq- p. 178

٢٢-ابن خلدون- المقدمة- الجزء الثاني- دار الجيل- ص ٤٤٦.

٢٣-الدكتور فؤاد حمه خورشيد -اللغة الكردية- التوزيع الجغرافي للهجاتها - بغداد- ١٩٨٣- ص٢٧.

٢٤-شەرەفخانی بەدلیسی- شەرەفنامە- وەرگێڕانی هەژار- ل ٣٧-٣٨.

٢٥-گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد- ژمارە (٢١-٢٢)- ل ٧١.

26-Thomas Boiss- The Kurd- p. 3.

٢٧-فردريك انجلس- اصل العائله و الملكيه الخاصة و الدوله- دار التقدم - موسكو- ص ٢٣٠.

٢٨-الدكتور محمد عابد الجابري- تكوين العقل العربي.

٢٩-عەبدوڵڵا غەفور- جوگرافیای دانیشتوانی کوردستان- سوید- ١٩٩٤- ل ٢٠.

٣٠-ابن خلدون- المقدمة -الجزء الثاني- ص ٤٤١.

31-Thomas Boiss- The Kurds- p. 31-32.

٣٢-عەتا قەرەداخی- چەمکی دەولەت- دامەزراوی میرنشین- سلێمانی- ١٩٩٩.

33-John Bulloch, and Harvy Morris- No Friends But the Mountains- Penguin Books- 1993-p.p.

٣٤-مەسعود محەمەد- حاجی قادری کۆیی-

35-Derk Kinnane- The Kurds of Kurdistan-London- 1961- p 8.

٣٦-عەتا قەرەداخی- چەمکی دەولەت- سلێمانی- ١٩٩٩- ل ٤.

# سەرەتا:

(مەبەست لە فیدراسیۆنی خێڵایەتی کۆبوونەوەو لێك نزیك بوونەوەو هاریکاری و پەیمان بەستن و دواتر یەکگرتنەوە لە نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کۆمەڵگادا بەگشتی یان لە نێوان بەشێك لە خێڵ و عەشیرەتەکانی کۆمەڵگایەکدا کە پێکەوە یەکەیەکی گەورەتر لە رووی قەوارەو هێزو ژمارەوە پێدێنن و سەرکردایەتیەکی یەککرتوویان دەبێت و ئەو سەرکردایەتیەش ناوەندی یەکەمی بڕیارو دەسەڵات دەبێت).

تاکو ئێستا بنیادی پێکهاتنی کۆمەلایەتی کۆمەڵگای کوردی لە رووی چین و توێژە کۆمەلایەتیەکانەوە، لەرووی خێڵ و عەشیرەتەکانەوە، لەرووی لادێ و شارەوە، بنیادێکی تێکەڵە و پێکەڵ و نەتوانراوە شیکردنەوەی بابەتیانەی بۆ بکرێت و شوێنی هەریەکە لەو رەگەزە پێکهێنەرانە لەرووی ئامادەبوون و جوڵەو ئیشکردنەوە دیاری بکرێت و لەسەر بنەمای ئەو دەرئەنجامانەش کە لە شیکردنەوەیەکی هەمەلایەنەی لەوجۆرەوە بەدەست دێت شێوەی کۆمەلایەتی و ئاستی ژیان و قۆناغی مێژوویی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی و جۆرەکانی ململانێی ناوخۆی کۆمەلایەتی و پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانیش دیاری بکرێت: هەر لە رێگای توێژینەوەی سەرجەم توخم و رەگەزە پێکهێنەرەکانی ئەم کۆمەڵگایەوە دەتوانرێت توێژینەوەی سروشتی گشتی کۆمەڵگاکە بکرێت و وەکو یەکەیەکی کۆمەلایەتی سەربەخۆ لە رێگای لێکۆڵینەوەی بەشەکانیەوە، لێکۆڵینەوەی ئەو یەکەیە بکرێت. دکتۆر عەلی وەردی

دەڵێت: چۆن دەشێت توێژینەوەی کۆمەڵگایەکی گەورە بکرێت هەتا توێژینەوەی بەشە بچووکەکانی ئەو کۆمەڵگایە یەك یەك نەکرێت(١).
دەشێ ئەم وتەیەش بەدوو ئاراستە، لێك بدرێتەوە بەگوێرەی کۆمەڵگای دابەشکراوی کوردی، ئاراستەی یەکەم برتیبە لە بەشە پێکهێنەرەکانی ئەم کۆمەڵگایە واتە مەبەست ئەو چین و توێژو خێڵ و عەشیرەتانەیە کە کۆمەڵگای کوردی پێکدێنن، ئاراستەی دووەم مەبەست بەشەکانی کۆمەڵی کوردییە کە لەرووی سیاسیەوە دابەشکراوەو سەرباری زۆر سیفات و خاسیێتی هاوبەش بەڵام دەشێ دابەشکردنی سیاسی و ئیداری کۆمەڵگای کوردی جۆرێك لە جیاوازی لە نێوان بەشەکانی ئەم کۆمەڵگا گەورەیەدا دروست کردبێت و هەریەکە لەو بەشانە پێویستی بەوە بێت توێژینەوەی تایبەتی بکرێت.
لە ئەنجامی توێژینەوەی هەمەلایەنەی بنیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیدا دەشێ چەند پرسیارێك سەرهەڵبدەن. وەکو ئەوەی کۆمەڵگای کوردی چ جۆرە کۆمەڵگایەکە؟ ململانێ کۆمەڵایەتیەکان لەم کۆمەڵگایەدا چ جۆرە ململانێیەکن؟ پەیوەندی نێوان یەکە پێکهێنەرەکانی ئەم کۆمەڵگایە چ جۆرە پەیوەندییەکە" ئایا لە قۆناغەکانی رابردوودا هاریکاری و یەکێتی لە نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا دروستبووە؟ ئایا فیدراسیۆنی خێڵایەتی پێکهاتووە؟ ئەگەر پێکهاتووە ئایا بۆچی لە ئەنجامی ئەو پێکهاتنەدا دەوڵەتی خێڵایەتی کوردی دروست نەبووە؟ ئەی ئەگەر فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردی پێکنەهاتووە، بۆچی پێکنەهاتووە؟ ئەو پێکنەهاتنە چ دەورێکی پۆزەتیف یان نێگەتیفی بینیووە لە مێژووی پەرەسەندی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایەدا؟ ئەمانەو چەندین پرسیاری تریش کە دەکەونە سنووری ئەو ناونیشانەوە کە لە سەرەوە دامان ناوەو پەیوەستن بە بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵگای کوردی و میکانیزمی کارکردنی سەرجەم توخم و رەگەزەکانی ئەو بنیادەوە، دەشێ لێکدانەوە بکرێن.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات لەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانە بگەڕێت بەو مەبەستەی تیشکێك بخاتە سەر واقیعێك کە هەموومان تیایدا دەژین، بەڵام نە بیر لە تایبەتمەندییەکانی ئەو واقیعە دەکەینەوە نە پەیش بەوە دەبەین کە تایبەتمەندییەکانی چییەو چ کاریگەرییەکی لەسەر بوون و چارەنووس و دوارۆژمان هەیە.

# بنیادی پێکهاتنی کۆمەڵگای کوردی

ئامانەوێت بگەڕێینەوە بۆ قسەکردن لەسەر بچووکترین یەکەی پێکهێنەری کۆمەڵگا کە خێزانە کە ئەو یەکەیەش لەوکاتەوە پێکهاتووە کە مرۆڤ سنووری لەنێوان خۆیی و زیندەوەرانی تردا دیاری کردووە. خێزان لەگەڵ رەوت و پەرەسەندنی ژیاندا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە چ لە شێوەی پێکهاتن و دەسەڵاتدا چ لە ئاراستەکردنی دەسەڵات و ناوەندی دەسەڵاتدا بەپێی قۆناغەکانی دەسەڵاتی ژن یان دەسەڵاتی پیاو واتە بەپێی سیستەمی خێزانی دایکسالاری یان باوکسالاری، کۆمەڵگا لە شێوازێکی پەیوەندییەوە گواستراوەتەوە بۆ شێوازێکی تر، بەهەرحاڵ ئەو مێژووە ئەوەندە کۆنە تەنیا دەکرێت لە شێوەی گشتیدا باسی لێوە بکرێت و ئاماژە بۆ سیفات و سیما گشتییەکانی بکرێت ئەو سیفاتە گشتیانەی کە لە ئەنجامی توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکانەوە بەدەست هاتوون و کۆکراونەتەوە.

تاکو ئێستا ئێمە نازانین پێکهاتەو سروشت و بنیادو چۆنێتی پێکهێنانی سەرەتایی ترین خێزانی کوردی چۆن بووە کە ئەو خێزانە وەکو یەکەیەکی سەرەتایی بنەمای پێکهێنانی کۆمەڵگای کوردییە.

سەرجەم ئەو توێژینەوە بە ژمارە کەمانەی کە لە بواری کۆمەڵناسی کوردیدا کراون نەیانتوانیووە لەدوای دیاریکردنی سەرەتاترین قۆناغ بگەڕێن کە کورد تیایدا وەکو کۆمەڵگا دەرکەوتووە، بگرە تاکو ئێستاش زۆربەی توێژینەوەو نووسینەکان لەسەر کۆمەڵگای کوردی دەربارەی

دیـاردە ئاشـــکراو لەبـــەرچاوەکانن، یـــان دەربـــارەی ســـیفات و دەرئەنجامـــەکانن لـــەبری ئـەوەی دەربـارەی بنیـادی پێکهێنـــەری ئـــەم کۆمەڵگایەو میکانیزمی کارکردنی ئەو بنیادەبن بە هەموو بەش و توخم و رەگەزەکانیەوە. لە بارەی پەیوەندی کۆمەڵناسی و بنیادی کۆمەڵایـەتی و دیـاردە کۆمەڵایەتیەکانـەوە کـە ئـەدرنۆ بـە پـەیوەندی نێوان چـەمکی کۆمەڵناسـی جـەدەلی و بواری پیـادەکردن نـاوی دەبـات دەڵێـت: ئـەوەی دەمەوێت لە بارەیـەوە بدوێم پیادەکردنە بەتاوایـەکی پـڕ مانـاو تـەواو، مەبەسـت لـەوەش ئەو پیادەکردنەیـە کـە پەیوەندیـە بـە بنیـادی گشـتی کۆمەڵـەوە هەیـە نـەك پـەیوەندی بـە هـەندێ دیـاردەی کۆمەڵایەتیـەوە هەبێت(٢). بەڵام بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەوە ئاخاوتن و پیادەکردنی هەندێ لێکۆڵینەوەی سادەی کۆمەڵناسی کوردی بە گشتی لەسەر دیاردە کۆمەڵایەتیەکان دەکرێن و لە ئاکامی ئەوەشدا ئەو لێکۆڵینەوانە نـاتوانن ببنـە لێکۆڵینـەوەی زانسـتیانە لـە بـواری کۆمەڵناسـی کـوردیدا، بـەڵکو پشـت بەستن بەو دیاردانە وەکو بنەما بـۆ ئاخـاوتن لەسـەر کۆمـەڵگای کـوردی کاریگـەری نێگـەتیفی هەیـە لـەو روانگەیـەوە کـە ئـەو جـۆرە لێکۆڵینەوانە هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتی دەکەن بە بنەما بۆ ئاخاوتن لەسەر کۆمـەڵگای کوردی کە لـە راسـتیدا ئـەو دیاردانـە بەشـی زۆریـان دەشێ بەکاریگەری هۆکاری دەرەکی دەرکـەوتبن یـان لـە کۆمـەڵگاکانی تـرەوە خواسـترابن. بـۆ نموونـە لـە رێگـای بوونـی زانکـۆوە ئـەو جـۆرە لێکۆڵینەوانە کۆمەڵگای کوردی بەکۆمەڵگایـەکی شارسـتانی دادەنێـن، لەسەر بنەمای بوونی گۆڤارو رۆژنامەو چاپ و بڵاوکردنەوەوە کۆمەڵگای کوردی بە کۆمەڵگایەکی خوێنەوار دادەنێن، لە رێگای بوونی رێکخراو و سەندیکاو کۆمەڵـە جۆراوجۆرەکانـەوە دەگوترێـت کۆمـەڵگای کـوردی کۆمەڵگایەکی دیموکراتی هاوچەرخە.

لە بەرامبەر ئەمانەدا لە رێگای شەڕو یەك کوشتنی دوو تیرە یان دوو خێڵ و عەشیرەتەوە لەسـەر لـەوەڕگا یـان لەسـەر زەوی کشـتوکاڵ یـان

لەسەر بەرژەوەندی مەعنەوی دەگوترێت کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی خێڵایەتی دواکەوتووی سەرەتاییە. هەروەها ئەم دیاردانەو چەندین دیاردەی تری لەم جۆرانە چ باش و چ خراپ لە ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی‌دا ناشێت بکرێت بە بەڵگەو بنەما بۆ دیاری کردنی ئاست و شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی چونکە ئەم دیاردانە دەرئەنجامی ژێرخانی کۆمەڵایەتی کوردی و بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردین لەبەرئەوە ئەگەر لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی کۆمەڵایەتی کوردی خۆی بەو بنیادەوە خەریک نەکات ناتوانێت ئەنجامی باش بدات بەدەستەوە. ئێمە پێشتر باسی یەکەی سەرەکی پێکهاتنی کۆمەڵگامان کرد کە خێزانە، بەڵام خێزان وەکو یەکەیەکی سەرەکی و سەرەتایی سیمایەکی گشتی و لە یەکچووی هەیە لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا، هەر بۆیە ناکرێت تەنیا لە سنووری توێژینەوەی خێزاندا بتوانرێت سەرجەم بنەما شاراوەکانی کۆمەڵگای کوردی ئاشکرا بکرێت، بەڵام خێزان لە کۆمەڵگای کوردی‌دا یەکەیەکی فراوانتر پێکدێنێت کە ئەویش یەکەی خێڵ و عەشیرەتە، خێڵ و عەشیرەت ئەو بنەمایانەن کە وەکو پێکهێنەری سەرەکی و دیاری کۆمەڵگای کوردی ئامادەبوونی تەواویان لە رووی پێکهاتن و عەقڵ و ستراتیژ و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی کوردی‌یەوە هەیە، واتە کۆمەڵگای کوردی بریتی‌یە لە یەکەیەکی فراوانتر کە سەرجەم خاسیەتەکانی خێڵ و عەشیرەتی کوردی هەیە، هەر بۆیە لە رووی توێژینەوەی کۆمەڵناسی‌یەوە لە سنووری ئەم کۆمەڵگایەدا باشتر وایە یەکەی خێڵ و عەشیرەت بکرێت بە بنەمای توێژینەوەو لێکۆڵینەوە.

کەواتە ئەگەر بمانەوێت لە پێکهاتنی کۆمەڵگای کوردی بدوێین دەبێ قورساییەکی تەواو بخەینە سەر توێژینەوەی پێکهاتەی خێڵ و عەشیرەتەکانی و خودی ئەو پێکهاتەیەو سروشتی دروستبوون و میکانیزمی کارکردن و جوڵەی دەست نیشان بکەین، ئەویش نابێت لە

رێگای کارکردن لەسەر دیاردە کۆمەڵایەتیەکان هەوڵی تێگەیشتن لەو بنیادە بدرێت، بەڵکو دەبێ شیکردنەوەی خودی بنیادەکە بکرێت واتە توێژینەوەی یەکە یان دامەزراوەکانی خێڵ و عەشیرەت دەروازەی یەکەمە بۆ خوێندنەوەی بنیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی.

# خێڵەت و عەشیرەت چین؟

زۆربەی کات زاراوەکانی خێڵ و عەشیرەت یان خێڵایەتی و عەشیرەتگەری وەکو جۆرێك لە رەخنە بەکاردەهێنرێن بۆ نیشاندانی شێوازی دواکەوتووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و خودی کۆمەڵگاش چونکە تاکو ئێستا ئەوەی لای ئێمە جێگای گرتووە ئەوەیە کە خێڵایەتی و عەشیرەتگەری دیاردەی کۆمەڵگای دواکەوتوو پاشڤەڕۆو لەمێژوو بەجێماون. بەڵام ئێمە پێمان خۆش بێت یان نا واقیعێکی کۆمەڵایەتی هەیەو ئێمە تیایدا دەژین و مەحکومین بە دەسەڵات و جۆرو ئاراستەی پەیوەندییەکانی و بەبێ پرۆسەیەکی گەورەو هەمەلایەنە لەگەشەو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ناتوانین هەنگاوی بەرەو دەربازبوون لەو بارە هەبووە هەڵبهێنین کە ئەویش واقیعی خێڵایەتی کوردییە.

خێڵ یان عەشیرەت ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە کە لە بنەڕەتدا لەیەك خێزانەوە کەوتوونەتەوە واتە نەوەی یەك باوکن و نەوە لەدوای نەوە ژمارەیان زیاترو سنووری پەیوەندییان فراوانترو هێزی پێکەوەبەستنیان کە پەیوەندییەکانی خێڵ یان عەشیرەت پەیوەندی خوێن و خزمایەتیە کە دەبنە هۆی پێکەوەگرێدان و پێکەوە بەستران لەم بارەیەوە ئیبن خەلدون دەڵێت: پەیوەندی هاو (رەحمی) پەیوەندییەکی سروشتییە لە بوونی مرۆڤدا و هاونەسەبی هۆی یەکێتی و پێکەوە گرێدانەو خێڵایەتی لە پێکەوە پەیوەستبوونی نەسەب (رەگ و ریشە) دروست دەبێت(٣).

کەواتە بە ئاشکرا دیارە کە خێڵ یان عەشیرەت وەکو یەکەیەکی

کۆمەڵایەتی لە ئەنجامی بوونی بنەمایەکی بەهێزی مەعنەویدا دروست بووە کە ئەویش خۆی لە سنووری پەیوەندییەکانی خوێن و دەماردا دەبینێتەوە. هەر لێرەوە لە سنووری بوونی خێڵ و عەشیرەتدا زاراوەی دەمار یان دەمارگیری دەردەکەوێت کە لە باری یەکەمدا واتایەکی نێگەتیفی هەیەو مەبەست لە تەنگ بینی و فەرزکردن و بەگەورەزانینی خێڵ و عەشیرەتی خۆیە بەسەر هەموو ئەوانی تردا کە ئەم دیاردەیە لە سنووری خێڵایەتی کوردیدا دیارو ئاشکرایەو یەکێکە لە هۆکارەکانی دوورخستنەوەی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد لە یەکتری و بنەمایەکی سەرەکی کێشەو ناکۆکیە خێڵایەتی و عەشیەرتگەرییەکانیشە لە کوردستاندا.

بەڵام لەلایەکی ترەوە ئیبن خەلدون دەمارگیری بەمانای پەیوەندی خێڵایەتی لەرووە کۆمەڵایەتیەکەیەوە بەکاردەهێنێت واتە لە ماناو خاسێنە نێگەتیڤەکانی رووتی دەکاتەوەو وەکو بنەماو هۆیەکی دروستکردنی ئەو دامەزراوە کۆمەڵایەتیە سەیری دەکات کە ئەو دامەزراوە بنەمای پێکهێنانی کۆمەڵگای کوردی و زۆربەی زۆری کۆمەڵگا دواکەوتووەکانە. هەر لێرەشەوە ئیبن خەلدون پەیوەندی دەمار دەکات بە بنەما بۆ بوونی خێڵ و عەشیرەت و خزمایەتی و پەیوەندی خوێن لەگەڵ هاودەماریدا تێکەڵاو دەکات و بەوەش خێڵ یان عەشیرەت پێك دێت لەسەر بنەمای ئەو تێڕوانینە خەلدونیەوە ئەوە بە ئەنجام دێت: کە لە بنەڕەتدا خێڵ لەسەر بنەمای خزمایەتی دروست دەبێت(٤). خێڵی کوردیش بەهەمان شێوە لەسەر بنەمای پەیوەندی خزمایەتی و خوێن و دەمارو هاوڕەحمی دروستبووەو لەرووی بنەچەی خێڵایەتیەوە هەمان خاسێتە گشتییەکانی خێڵی کۆمەڵگاکانی تری هەیە.

ئامارژەمان بۆ ئەوە کرد کە خێڵ ئەو دامەزراوە کۆمەڵایەتیەیە کە راستەوخۆ پەیوەندی خوێن و دەمار بنەمای دروستبوونیەتی و سەرجەم ئەندامانی خێڵ لە ئاست و پلەی جیاوازدا دەبنەوە بە بەرهەمی یەك

پشت کە دیاریکردنی ئەو پشتەش وەکو کەسی یەکەم تاکو ئێستا لە کۆمەڵگای کوردیدا کارێکی ئەوتۆی بۆ نەکراوەو ئەوەی کە لەنێو کۆمەڵگای کوردیدا جێگیربووە دەربارەی سەرچاوەی یەکەمی پێکهاتنی خێڵەکان جگە لە قسەی ئاسایی و دەماودەمی نێو کۆمەڵانی خەڵك و خودی خێڵەکان هیچی تر نیە. بۆ نموونە لە مێژووی خێڵێکدا لە قۆناغێکی دیاریکراودا پیاوێکی جوامێر دەرکەوتووەو دەورێکی گرنگی هەبووە لە ئاساندنی خێڵەکەیدا لە بەرامبەر خێڵ و عەشیرەتەکانی تردا یان رەنگە ئەو جوامێرە تونیبێتی دەسەڵاتی خێڵەکەی فراوان بکات و ناوچەی جوگرافی خێڵ و عەشیرەتەکانی تریش بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو جۆرە دەسەڵاتێکی سنووردار بۆ کاتێکی دیارکراو دروست بکات، ئیتر ناوی ئەو جوامێرە لە مێژووی خێڵەکەیدا یان عەشیرەتەکەیدا بڵند بوو بێت و وەها دەرکەوتبێت کە ئەو خێڵە لەو پیاوەوە دەست پێبکات، بۆ نموونە چەند خێڵ و عەشیرەت یان تیرەکانی خێڵ هەن لە کوردستاندا بەو جۆرە بەناوی تاکەکەسێکەوە دەناسرێن. ئەگەر سەرنجی هەندێ لە تیرەو خێڵەکان بدەین ئەوە ئەم قسەیەمان زیاتر بۆ ئاشکرا دەبێت کاتێ ناوی تیرەکانی شێخ سمایلی و وەیس وەیس و روغزایی و بنەماڵەی بەدرخانی دەبینین، دیارە تیرەو تایەفەکانی هەر خێڵێك بەناوی ئەو کورانەی خێڵەکەوە ناونراون کە ئەو تیرەیە دەگەڕێنەوە سەریان.

بێگومان لە مێژووی خێڵایەتی کوردیشدا جوگرافیا دەورێکی گرنگی بینووە لە ناونانی خێڵ و تیرەکانیدا. هەر خێڵێك یان تیرەو هۆزێك لە کام جوگرافیادا ژیابێت ئەوە خێڵ یان تیرەکانی بەناوی ئەو جوگرافیایەوە ناونراوە. وەکو خۆشناوەتی، بەرزنجی، بەرزانی، شاکەلی، تاڵەبانی.. ئەمەش راستەوخۆ ئەو دەلالەتە هەڵدەگرێت کە کورد زێدو شوێنی ژیانی زۆر بەلاوە گرنگ و بڕ بایەخ بووەو لەبری ئەوەی زۆربەی کات بەناوی

باوك و باپیرەوە ناوببرێت یان بانگ بكرێت ئەوا بەناوی زێدو شوێنی لەدایكبوون و ژیانیەوە ناوبراوە.

دیسان زاراوەی جوگرافیا كە بووە بەناوی خێڵ و عەشیرەتەكانی كورد لە رابردوودا دەشێ وەكو پێوانەیەكی تا ئەندازەیەك دروست بەكاربهێنرێت بۆ جیاكردنەوەی خێڵی نیشتەجێو سەقامگیری كوردی لە خێڵی كۆچەری كوردی چونكە تەنیا ئەو خێڵ و عەشیرەتانە بەناوی جوگرافیای نیشتەجێ بوونیانەوە ناونراون كە لەو جوگرافیایەدا سەقامگیر بوون و ئەو جێگا بووە بە ملكی ئەوان و ئەوان خاوەنی راستەقینەی بوون، بەلام بەگوێرەی خێڵی كۆچەری كوردی ناكرێت بەناوی جوگرافیاوە ناوببرێن باشترین نموونەش ئەگەر بێت و سەرنج لە خێڵ و تیرە كۆچەرەكان بدەین زیاتر بەناوی كەسێكەوە یان سیفەتێكی دیاری ئەو خێڵ و تیرەیەوە ناونراون. جگە لەوە شتێكی ترمان بۆ ئاشكرا دەبێت كە ئەویش ئەوەیە زۆربەی ئەو عەشیرەتانەی كە بەناوی جوگرافیا یان زێدو شوێنی نیشتەجێبوونەوە ناونراون ئەوانەن كە لە رووی درەختی بنەماڵەكانیانەوە خۆیان دەبەنەوە سەر پێغەمبەرو كەس و كاری.

بێگومان پێكهاتەی خێڵ لە رووی هاتنەخوارەوەو شێوەی دەسەلاتەوە لە هەرەمێك دەچێت كە باوكی یەكەمی ئەو پێكهاتەیە واتە خێڵ و عەشیرەت لە لوتكەی هەرەمەكەدایەو ئەوە بەدوای ئەوەدا رووبەری بنكەی هەرەمەكە فراوان دەبێت. ئەو بنكەیەش لە هەرەمی شێخ و سەیدەكاندا بە یەكگرتووی دەمێنێتەوە واتە هەرەمی پێكهاتنی شێخ و سەیدەكان دابەش نابێت چونكە ئەم هەرەمەیان لە كۆمەڵگای كوردیدا دابەش نابێت بۆ چەند تیرەیەك بەڵكو دەشێ ببێت بە چەند بنەماڵەیەك، بەلام بنەماڵە لە خودی هەرەمەكە جیانابێتەوە واتە هەرەمی شێخ و سەیدەكان وەكو یەكەیەك دەمێنێتەوە، بەلام هەرەمی خێڵەكان (غەیری

شێخ و سەید) زۆربەی کات دابەش دەبێت بۆ چەند یەکەیەکی بچووکتر کە ئەوانیش تیرەکانن.

هەر تیرەیەك سەربارى پەیوەندی مادی و مەعنەوی بەخێڵەکەیەوە بەڵام وەکو یەکەیەکی تا رادەیەم سەربەخۆ دەردەکەوێت و ئاراستەی پەیوەندی کردن زیاتر لە سنووری داخراوی تیرەکەدا دەبێت و کەمتر دەپەڕێتەوە بۆ سنووری تیردکانی تری هەمان خێڵ، مەگەر لەکاتی شەڕو ناکۆکی تیرەکانی تری ئەو خێڵەدا لەگەڵ عەشیرەت یان خێڵێکی دەرەوەی خێڵەکەی خۆیاندا ئەندامانی ئەو تیرەیە خوێن و دەماریان هەڵبچێت و هەست بکەن کە ئەو دوژمنکاریەی دەرەوەی خێڵ با بەرامبەر تیرەیەکی دیاری خێڵەکەی ئەمان بێت بەڵام هەموو خێڵەکەیان دەگرێتەوە. واتە تیرەکانی هەمان خێڵ سەرباری ئەوەی زۆرجار لەناو یەکتردا ناکۆك دەبن و شەڕو تەنانەت کوشتاریش لەیەك دەکەن بەڵام لە ئاستی دوژمنایەتی دەرەوەدا بۆ سەر هەر تیرەیەکی خێڵەکەیان ئەمان وا هەست دەکەن کە ئەو دوژمنایەتیە دەرەکیە دوژمنایەتی هەموویانە، ئەمەش لە راستیدا بەشێکە لە ستراتیژو عەقڵی خێڵایەتی کە ئێمە لە کۆمەڵگای کوردی‌دا بە ئاشکرا ئەوە دەبینین. تەنانەت لە مێژووی نوێی کورددا زۆرجار بزوتنەوەو حیزبەکانیش هەمان هەڵوێستیان هەبووە، سەرباری ناکۆکی نێوانیان بەڵام کە هەموو کورد کەوتۆتە بەردەم مەترسی‌یەوە ئەوە حیزبەکان جۆرێك یەکگرتنەوە لە نێوانیاندا دروستبووە ئەگەرچی کورت خایەنیش بووبێت.

لە هەرەمی خێڵی کوردی‌دا ئاراستەی فەرمان لە لوتکەی هەرەمەکەوە دەردەچێت و هەموو هێزو تواناو کەسێتی خێڵیش لە کەسێتی لوتکەی هەرەمەکەو دەسەڵات و بڕیارەکانیدا دەردەکەوێت، بەهێزترین خێڵ و عەشیرەت یان دیارترین خێڵ و عەشیرەتی کوردی لە رووی مەعنەوییەوە ئەوەیە کە سەرخێڵ یان سەرۆك عەشیرەتێکی جوامێرو لێهاتووی هەبووە یان هەبێت.

سروشــتی پەیوەندییــەکان و چۆنێتــی ئاراســتەکردنی فــەرمان و پیادەکردنی لەم هەرەمەدا ە ەمووی دەبەسـترێتەوە بـە لوتکـەوە، چـەند ماوەی نێوان لوتکەو بنکـەی هەرەمەکە دووربکەوێتەوە بـەو ئـەندازەش شـێوازو ئاسـتی پەیوەندییـەکان و پێکـەوە بەسـتنی ئـەندامانی ئـەو دامـەزراوەو یەکـە بچووکـەکانی (تیرەکـان) لاوازتـر دەبێـت کـە ئەمـەش دەورێکـی کاریگـەر نێگـەتیفی بینیـووە لـە رسـکاندن و خـەملاندنی بنەماکانی یەکگرتنەوەو هاریکاری کردنی یەکتری نێوان پێکهێنەرەکانی کۆمـەڵگای کـوردی، واتـە ئـەو لاوازبوونـەی پەیوەندییـەکان یەکێکـە لـە بەربەستەکانی بەردەم درستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی لە کۆمـەڵگای خێڵایـەتی کـوردی‌دا، هـەر ئـەو تێڕوانینـەو کاریگـەری و سـێبەری ئـەو عەقڵیەتـە لـە مێـژووی نوێشـدا بۆتـە بەربەسـت و رێگـر لــە بــەردەم دروستبوونی (بەرەی یـەکگرتوو) لە بزوتنەوە جۆراوجۆرەکانی رزگـاری نیشتمانیدا لەسەرجەم پارچەکانی کوردستاندا. هەر لەم روانگەیەوەیە کـە زۆرجـار دەڵێـین سـتراتیژی بزوتنــەوە نەتەوەییـەکانی کــورد تــاکو مێـژووی ئێسـتاش زیـاتر بـەلای سـتراتیژو عەقڵیـەتی خێڵایـەتیدا دەشکێتەوە.

لەم هەرەمەی خێڵی کوردیدا کە لە یەك ساتەوەختدا چەندین هـەرەمی سەربەخۆ لە شێوەیەکی تەریب بەیەکدا ئامادەبوونیان هەبووەو هەریەکە لەو هەرەمانەش لە سەرەوە بۆ خوارەوە تەریب بەیەکتر درێژ بوونـەتەوەو نـە یـەکیان گرتووە نـە تێکـەڵاوی یـەکتربوون هـەتا یـەکگرتن و نزیکـی لـە نێوانیـاندا دروسـت ببێـت، بـەڵکو هـەندێ جـار لـە ئـەنجامی نـاکۆکیدا هەوڵیان داوە یەکتر ببڕن، ئەو یەکتربڕینەش بووە بە مایەی شەڕو ئاژاوەو خوێن رشتنی یەکترو بریندارکردنی جەستەی هەرەمـەکان کـە ئـەوەش یەکێکە لە سیفاتە سەرەکی و هەمیشە ئامادەو بەردەوامەکانی خێڵایەتی کوردی، کە ئەم حاڵەتەش بواری لە یەکتر نزیکبوونەوەو هاریکاری نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کوردی تەسك کردۆتـەوە بـەوەش رێگای بـەردەم

دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردی داخراوەو لە بری هاریکاری و یەکگرتنـــەوە هـــەر خێـــڵ و عەشـــیرەتە هـــەوڵیداوە پارێزگـــاری لەسەربەخۆیی خۆی بکات.

لە بارەی خێڵی کوردییەوە مارتن ڤان برۆنسن دەڵێت: خێڵی کوردی یەکەیـەکی سیاســی- کۆمەڵایەتی‌یـەو هـەروەها بەشـێوەیەکی گشـتی یەکەیەکی ناوچەیی و ئابوریشە کە بەندە لەسەر رەگ و ریشە (نسب) و خزمایەتی راستەقینە یان خواستراو لەگەڵ بنیادێکی خاوەن خاسێتی نـاوخۆیی(٥). ئـەم پێناسـەیەی برۆنسـن زۆرێـك لـە خاسـیەتە گەوهەرییەکانی خێڵی کوردی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە. بەڵام ئەم پێناسەیە لەسەر بنەمای لێکدانەوەی یەکەی خێڵ وەکو دامـەزراوێکی سـەربەخۆ کراوە بە پشت بەستن بـە سیفات و خاسێت و دیـاردە کۆمەڵایـەتی و ژیارییەکانی خێڵ و کەمتر شۆڕبۆتەوە بۆ گەوهەری ئەو پێکهاتەیە تەنیا ئەوەندە نەبێت کە خێڵ لە رەگ و ریشەو خزمایەتیدا یەك پێدەگرێتەوە بەڵام ئەم بنەمای ئابوری و سیاسی دەخاتە پێش بنەمای رەگ و ریشەو پەیوەندی (هاوڕەحمی) و خوێن و خزمایەتیەوە، بە واتایـەکی تـر ئـەم هەوڵیداوە لە دیووی دەرەوە لە ناوەوەو گەوهەری خێڵی کوردی تێبگات و بزانێت چیە. کە لە راستیدا دیـووی دەرەوەو سیفات و خاسێتەکانی خێڵی کوردی سەرجەم رەنگدانـەوەی ئەو بنیـادەی ناوەوەیە کە خێڵـی کوردی پێکهێناوە.

# زاراوەی خێڵ و عەشیرەت

یەکێك لە گرفتەکانی نووسین لەسەر بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵگای کوردی گرفتی زاراوەکانە کە جۆرێك لە تێکەڵ و پێکەڵی و نزیکی هەیە لە نێوانیانداو تاکو ئێستاش زاراوەکان جێگیر نەکراون و چ لە نووسیندا چ لە بەکارهێنانی ئاسایی نێو خەڵکی‌دا، هەمیشە جێگۆڕکێیان پێ دەکرێت و لەجیاتی یەکتر بەکار دەهێنرێت. بۆ نموونە تاکو ئێستا جیاوازی نێوان خێڵ و عەشیرەت نازانرێت چی‌یە. زۆرجار جیاوازی لە نێوان زاراوەکانی خێڵ و تیرەو هۆزو تایەفەو عێل و بنەماڵەدا ناکرێت یان لەجیاتی یەکتر بەکاردەهێنرێت. بە تێڕوانینی من گرنگ ئەوەیە ئەم زاراوانە جێگیر بکرێن و هەریەکە پێناسەی خۆیی هەبێت چونکە لە رووی ماناوە ئەم زاراوانە زۆر نزیکن لەیەکتری. زۆربەی کاتیش وەکو جۆرێك لە رەخنە لەباری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایەك زاراوەکان بەم شێوەیە بەکاردەهێنرێن: خێڵایەتی، عەشیرەتگەری، تیرەگەری و تیرەچێتی و هۆزگەری.. کە ئەم بەکارهێنانانەش بەمەبەستی نیشاندانی دواکەوتوویی و تەنگەنەفەسی و تەسکی تێڕوانین و گرنگی‌دان بە خزمایەتی و پەیوەندییەکانی خوێنە.

ئێستا با زاروەکان بەجێبهێڵین و بگەڕێینەوە بۆ نێو بنیادی کۆمەڵایەتی خێڵایەتی کۆمەڵگای کوردی. لەنێو بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵگای کوردی‌دا دوو دامەزراوی هاوشێوە هەیە کە لە رووی پێکهاتن و عەقڵ و ستراتیژەوە ئەم دوو دامەزراوە تارادەیەکی زۆر لە یەکتر دەچن.

بەڵام یەکێکیان دامەزراوی ئاسایی خێڵەو ئەویتریان دامەزراوی کۆمەڵایەتی شێخ و سەیدەکانە کە لەنێو کوردەواریدا بەم دامەزراوەیان ناگوترێت خێڵ بەڵکو زیاتر پێی دەگوترێت عەشیرەت. بۆ نموونە دەگوترێت عەشیرەتی بەرزنجی بەڵام خێڵی یان عێلی جاف یان مورادی.

ئەم دوو دامەزراوە لەرووی ئەسڵ و رەگەزەوە، لە رووی رەگ و بنەچەوە هەریەکەیان دەبێتەوە بەکوری یان نەوەی باوکێك. دامەزراوی شێخ و سەیدەکان زیاتر بنەچەو ئەسڵێکی ئایینیان هەیەو لەسەر ئەو بنەمایەش بوونەتە خاوەنی دۆکیومێنتێکی مەعنەوی جیاواز لە دۆکومێنتی خێڵەکان.

ئەو دۆکیومێنتەش درەختی بنەماڵەیە کە سەیدو شێخەکان بەپێی ئەو بەڵگەنامە مەعنەویە دەچنەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام. بەڵام دامەزراوی دووەم یان هەر درەختی بنەماڵەیان نیە ئەگەر هەیشیان بێت ئەوا ناچنەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام بەڵکو دەچنەوە سەر خەلیفەکانی تری ئیسلام یان دەچنەوە سەر هاوەڵ و کەسانی نزیك لە پێغەمبەرەوە کە ئەوانیش بەشی هەرە زۆریان لە تیرەو لقە جیاوازەکانی تری قورەیشن. بۆ نموونە رەگ و ریشەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی کە لە تیرەی میکایەلی سەر بە خێڵی جافە بەپێی درەختی بنەماڵەکەیان: لە نەوەی خەلیفەی سێهەم حەزرەتی عوسمانی کوری عەفانە(٦). لێرەوە دەردەکەوێت دامەزراوی خێڵایەتی کوردی دوو جۆرە بەپێی درەختی بنەماڵەو زیاتریش وا پێدەچێت کە سەیدو شێخەکان کە دەچنەوە سەر پێغەمبەر بە عەشیرەت ناوبرێن و ئەوانی تریش کە بەرەچەڵەك ناچنەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام بە خێڵ ناوبرێن. ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە خودی ئەو دۆکیومێنتە ئەگەر لە روانگەی ئەسڵی رەگەزی کوردەوە سەیر بکرێت ئەوا دەردەکەوێت کە ئەو دۆکیومێنتە شتێکی دروستکراوەو هیچ خێڵ و عەشیرەتێکی کورد ناچێتەوە سەر پێغەمبەرو خەلیفەکانی راشیدین و هاوەڵەکانیان. ئەگەر لەم روانگەیەشەوە

سەیربکەین ئەوا ئەو پیرۆزییەی کە عەشیرەتەکانی کورد (شێخ و سەیدەکان) بۆیان دروستبووە هەرەس دەهێنێت ئەگەر بێت و بنەمای پیرۆزییەکە درەختی بنەماڵەکانیان بێت، بەڵام ئەگەر ئەو پیرۆزییە لەسەر بنەکای شوێنی دیاری ئەمان لە ئایینی ئیسلامدا دروست بووبێت ئەوا دەتوانن بە دڵسۆزییان بۆ ئایینەکە پارێزگاری لێبکەن.

لەلایەکی تریشەوە بوونی درەختی بنەماڵە یان نەبوونی جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا دروست دەکات و لەبری لەیەکتر نزیک کردنەوە لە یەکتریان دوور دەخاتەوە، بەتایبەتی کاتێ ئەوانەی کە دەچنەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام خۆیان بە لەپێشترو بەرزترو پیرۆزتر دەزانن و زۆربەی کات بەچاوێکی نزمتر دەڕواننە خێڵەکانی تر یان ئەو کەسانەی لە دەرەوەی خێڵن. هەر لەم تێڕوانینەوە دەبینین کە درەختی بنەماڵەش لە مێژووی خێڵایەتی کوردیدا دەورێکی نێگەتیفی بینیووە لە نزیک کردنەوەی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا لە یەکتری و بگرە هۆیەکی سەرەکییە بۆ ڕێگاگرتن لە دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد کە دەشیا لەو فیدراسیۆنە دەوڵەتی خێڵایەتی کوردی دروست ببووایە.

پێشتر گوتمان دامەزراوی خێڵ دابەش دەبێت بۆ یەکەی بچووکتر کە ئەوانیش تیرەکانن، بۆ نموونە خێڵی جاف کۆمەڵێ تیرەی زۆری هەیە بەڵام هەموویان بەتیرەی جاف ناودەبرێن، مکایەڵی جاف، روغزایی جاف و جافە رەشکە،.. تاد. بەڵام لەناو دامەزراوی شێخ و سەیدەکاندا ئەم جۆرە دابەش بوونە نیە، دەشێ لەبری تیرە بگوترێن بنەماڵەی فلان کەس یان شێخ فلان، بەڵام ئەوە نابێتە تیرەو سیفات و خاسیێتەکانی تیرەی نیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شێخ و سەیدەکان ئەگەر بە عەشیرەت ناویان ببەین ئەوە کەمتر یەکەی جۆراوجۆرو بچووکتری لێدروست دەبێت و ئەوەش وا دەکات کە ئەبڕیارو ئە ناوەندی دەسەڵات لە دامەزراوی شێخ و سەیدەکاندا دروست نەبێت، بەڵکو دەسەڵات و بڕیار لە لوتکەی

هەرەمەکەدا کۆببێتەوەو زۆربەی کاتیش جۆرێك لە هاوشانی لە نێوان ئەندامانی (عەشیرەت) واتە دامەزراوی شێخ و سەیدەکاندا هەیە کە کەمتر خاسێتی لە سەرەوە بۆ خوارەوەی شێواز هەرەمی پێوە دیارە بەڵکو زیاتر وەکو جۆرە پەیوەندییەکی ئاسۆیی لەنێوان ئەندامانیدا دەردەکەوێت. یان لە حاڵەتێکی تردا تەنیا جێگاو شوێن و پایەی ئایینی و پلەی خوێندن و هەڵسوڕان و شوێنی کۆمەڵایەتی ئەندامێکی دامەزراوی شێخ و سەیدەکان بباتە پێشەوەو لە سەرووی ئەوانی ترەوە دایبنێت. دیسان لە کۆمەڵگای کوردیدا شێخ و سەیدەکان لە ڕێگای رابەرایەتی ڕێبازەکانی تەسەوفیشەوە چوونەتە پێشەوەو پایەی کۆمەڵایەتی بەرزیان بەدەست هێناوەو بەوەش بوونەتە کەسی یەکەم لە هەرمەکەیانداو بگرە لە پانتاییەکی بەرفراوانی جوگرافی و کۆمەڵایەتیشدا کە کەسێتی ئەو رابەرانە سنورەکانی خێڵایەتی بەزاندووەو وەکو رابەرێکی رۆحی لەنێو خێڵ و عەشیرەتە جیاوازەکاندا ئامادەیی خۆیی سەلماندووە. بەڵام دیسان ئامادەبوونی ئەو رابەرە رۆحیە یان ئەو شێخ و رابەرە ئایینی‌یە کە سنوری زۆربەی خێڵ و عەشیەرتەکانی بڕیوە نەیتووانیووە ببێتە هۆی دروستکردن و پێکهێنانی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد.

شوێن و پایەی کۆمەڵایەتی بنەماڵەی شێخ مارفی نۆدێ و نەوەکانی واتە کاك ئەحمەدی شێخ و شێخ مەحمودی حەفیدیش کە لە سەرووی هەموو ئەندامانی تری عەشیرەتی بەرزنجی‌یەوە بوون بە کاریگەری جێگاو پلەو پایەی ئایینی و تەریقەت بووەو دواتریش لە سەردەمی شێخ مەحموددا پلەوپایەی نیشتمانپەروەری و خەبات لە پێناوی نەتەوەدا لەجیاتی خەبات لە پێناوی عەشیرەت یان خێڵدا بۆتە هۆیەکی دیارو کاریگەر لە بردنە پێشەوەی شوێنی ئەو بنەماڵە بە گشتی و شوێنی شێخ مەحمود بەتایبەتی کە لەبری ئەوەی تەنیا لە لوتکەی هەرەمی عەشیرەتی بەرزنجی‌دا بێت بەڵکو چووەتە لوتکەی هەرەمێکی

گەورەترەوە ئەگەرچی ئەو هەرەمە گەورەیە هەرەمێکی پتەو و یەکگرتوو نەبووە ئەویش هەرەمی بەشێکی دیاریکراوە لە کورد.

شێخ مەحمود و بنەماڵەکەیان لەسەر بنەماکانی پایەی ئایینی و تەسەوف ئەو جێگا دیارەیان گرتووەو نەك هەر لەنێو عەشیرەتەکەی خۆیاندا لە پێشەوە دانراون بەڵکو لە رووبەرێکی فراوانی کوردستاندا بوونەتە هێمای پیرۆزی ئایینی و تەسەوف و هێمای کوردایەتی.. بەڵام لە رووی ئەسڵ و رەگ و ریشەوە ئەوانیش هەمان شێوەی سەرجەم عەشیرەتی بەرزنجی و بگرە شێخ و سەیدەکانی تریش دەچنەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام و کەس و کاری بەپێی ئەو درەختی بنەماڵەیەی کە وەکو دۆکیومێنتێکی مەعنەوی دروستکراوەو چەندین کەسی دیارو باوەڕپێکراوی وەکو کاك ئەحمەد شێخ شایەتی راستیان بۆ داوەو مۆریان کردووە.

ئەم شێوازە پەیوەندییەو میکانیزمی کارکردنی لە سنووری پێکهاتەی شێخ و سەیدەکاندا کە زیاتر پەیوەندییەکی ئاسۆییە لەچاو ئەوەیدا بەتەنیا پەیوەندییەکی ئاراستە شاقوڵی یان ستوونی بێت جۆرێك لە هاوشانی و بگرە یەکسانیشی تێدایە کە هەریەکە لەجێگای خۆیەوە، خۆی لە ئاستی ئەوانی تردا دەبینێتەوە بەڵام لەدامەزراوی خێڵدا ئەو جۆرە میکانیزمەی کارکردن نیە، بەڵکو ئاغا یان بەگ یان سەرخێڵ لە لوتکەی هەرەمەکەدایەو سەرجەم ئەندامانی خێڵ تەنانەت هەندێ جار بە تیرە جۆاروجۆرەکانیشەوە راستەوخۆ لەژێر سایەی دەسەڵات و بڕیاری ئەو سەرخێڵەدا دەجوڵێن و ئەوەی پلەیەك لەسەر خێڵەوە نزیکترە لە خێڵدا یان ئەوەی پلەیەك لە سەرۆکی تیرەوە نزیکترە لە تیرەدا ئەوا جێگای ئەو لە پێش ئەندامانی ترەوەیەو پایەیەکی بەرزتری دەبێت.

دیارە جێگای خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە بوونی خێڵ و عەشیرەت تەنیا خاسیەتی کۆمەڵگای کوردی نیە، بەڵکو زۆربەی کۆمەڵگاکانی دنیا لەم جۆرە دامەزراوانە پێکهاتوون و لەگەڵ

پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و دروستبوونی دەوڵەت و دروستبوونی کۆمەڵگای شاردا ئەم دامەزراوانە پوکاونەتەوەو دامەزراوی کۆمەڵگای شار جێگای گرتوونەتەوە، بەڵام لە کۆمەڵگای کوردیدا لەبەر سستی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم دامەزراوانە و عەقڵ و ستراتیژی ئیشکردنیان تاکو ئێستا ئامادەبوونی تەواوی هەیەو سیمای ژیانی کوردەوارییە سەرباری بوونی چەندین شاری گەورەش.

## جوگرافیای خێڵی کوردی و دەوری تۆپۆگرافیا لەسەر دامەزراوی خێڵایەتی کوردی

مەبەست لە جوگرافیای خێل ئەو ناوچەو هەرێمەیە کە خێڵێکی تایبەتی تێیدا دەژی و نیشتەجێ بووە یان گەرمیان و کوێستانی تێدا کردووەو قەڵەمڕەوی بووە. ئەو ناوچەیە بۆتە شوێن دەسەڵاتی ئەو خێڵەو هیچ خێڵ و عەشیرەتێکی تر مافی ئەوەی نەبووە یان نیە پێ بخاتە نێو ئەو سنوورەوە چ لە رووی دەسەڵاتەوە چ لەرووی تێدا ژیان و بەکارهێنانەوە. لە کوردستاندا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین خێڵ و عەشیرەتەکان بەپێی جوگرافیاش جیاکراونەتەوە، بۆ نموونە خێڵێکی گەورەی وەکو جاف بەهەموو تیرەکانیەوە چەندین شوێنی دیاری جوگرافیان داگیرکردووەو ژیانی تێدا دەگوزەرێنن هەر لە دەوروبەری کفریەوە بە دەوروپشتی سیرواندا دەکشێن بۆ شارەزوورو بۆ ناوچەکانی جوانرۆ.. تاد، هەندێ تیرەیان کەوتوونەتە ناوچەی دوورتر لەم هێڵەوە. ئەو ناوچانەی کە ئەم خێڵە تێیدا دەژین بەجێی دەسەڵات و نفوزی جاف دادەنرێت و زۆربەی کات دەسەڵاتی ئەم خێڵە لەو جوگرافیایەدا لە دەسەڵاتی دەوڵەت زیاتر بووەو وەکو فەرمانڕەوایەکی بەهێزی ناوچەیی دەرکەوتووە کە یاساو دەستووری بەڕێوەبردنی خۆیی هەبووە.

ئەگەرچی پێشتر زۆربەی خێڵەکانی کورد لە کۆچی گەرمیان و کوێستاندا بوون و نیشتەجێ نەبوون بەڵام دیسان سنووررو قەڵەمڕەویان دیارو سنوور دیاری کراو بووە، ئەگەرچی گەرمیان و کوێستان کردن دەورێکی کاریگەری بینیووە لەوەدا کە کوردی کۆچەری ئەوەندە پەیوەستی خاك نەبێت و لەمەر کوێ دەواری هەڵداو باری خست ئەوێ بەزێدو نیشتمانی خۆی بزانێت، نیشتمانێکی سەفەری. لە ئاستێکی قوڵتردا مەسەلەی گەرمیان و کوێستان و نیشتەجێ نەبوونی کورد وای لێکردووە کە هەست بە بوونی زێدو نیشتمانکردنی زۆر لاواز بێت و لە ئەنجامی ئەوەشدا هەستی نیشتمانیو نەتەوەیی دوابکەوێت و بە ئاسانی نەڕسکێ و کاتێکیش رسکا بەلاوازی بڕسکێ چونکە یەکێك لە هۆیە سەرەکیەکانی خۆشوویستنی خاك و نیشتمان نیشتەجێ بوونە لەو خاك و نیشتمانەدا. لێرەدا سەرنج بۆ خاڵێکی تری پەیوەست بەم مەسەلەیەوە رادەکێشین. لە مێژووی کورددا دامەزراوی شێخ و سەیدەکان (کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردو گوتمان پێمان باشە ئەم دامەزراوە بە عەشیرەت ناو ببەین) زووتر نیتشەجێ بوون و پەیوەستبوون بە خاکەوە لە ئەنجامی ئەوەشدا توانیوویانە ئاوەدانکردنەوە بکەن و مزگەوت و خوێندنگای ئاینیان هەبێت و خوێندەواری لە ناویاندا بڵاوببێتەوە کە ئەوەش یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی زووتر دەرکەوتن و رسکانی هەست و هوشیاری نەتەوەیی هەر بۆیە لەنێو شێخ و سەیدەکاندا لەلای خوێندەوارو رابەرە ئاینییەکان زوتر هەستی نەتەوایەتی کوردی دەرکەوتووە. ئەگەر سەرنجی مێژووی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی کورد بدەین ئەوا دەبینین بەشێوەیەکی زۆر لەبەرچاو رابەرو سەرکردەکانیان شێخ و سەیدو رابەرەکانی ئاینی بوون یان ئەو ئاغاو بەگانە بوون کە خێڵەکانیان لە زووەوە نیتشەجێ بوون و وازیان لە گەرمیان و کوێستان هێناوەو پەیوەست بوون بە خاکەوە. مەبەست لەم قسەیە ئەوە نیە کە لە شوێن و

پایەی نیشتمانپەروەری خێڵە کۆچەرەکانی کورد کەم بکەینەوە نەخێر بەڵکو مەبەستمان دیاریکردنی کاریگەری نیشتەجێ بوون و پەیوەستبوون بە خاکەوەیە لەسەر سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی، کە لە خۆیدا سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی بەرهەمی قۆناغێکی پەرەسەندوتری کۆمەڵایەتیە لەچاو پەیوەستبوون بە خێڵ و کەلتوری خێڵ و عەقڵ و ستراتیژی خێڵەوە دیارە. دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە زۆر لە پێش دەرکەوتنی شێخ و سەیدەکانەوە لە کوردستاندا ژیانی نیشتەجێبوون دەستی پێکردووەو هەندێ لە خێڵەکان نیشتەجێ بوون.

جوگرافیای خێڵ و عەشیرەت لە رابردوودا دوو مانای هەبووەو بۆ ئێستاش ئەو دوو مانایە راست و دروستن، مانای یەکەم جوگرافیا ئەو زەمینەیە بووە کە خێڵ و عەشیرەت ژیانی خۆیان لەسەر دابین کردووە. واتە ئەو جوگرافیایە بریتی بووە لە پاکژو لەوەرگا بۆ ئاژەڵ و مەڕو ماڵات و ئەوانەشی کە تیایدا نیشتەجێ بوون و کشتوکاڵیان کردووە ئەو جوگرافیایە سنووری جوڵەو کارکردن و نان پەیداکردنیان بووە.. واتە جوگرافیای خێڵ ئەو زەمینەیە کە بنەماو پێداویستییە مادییەکانی خێڵ و عەشیرەتی پێکهێناوە. بێ بوونی جوگرافیایەکی دیاری کراو ناشێت باسی خێڵ و عەشیرەت بکرێت چونکە ئەو کەسەی یان ئەو دەستە کۆمەڵایەتیەی لە کوردەواریدا جوگرافیای تایبەتی خۆیی نیە ئەوە خێڵ یان عەشیرەتی نیەو بە زمانی سادەی خەڵك پێی دەگوترێت (مسکێن)، کە ئەمانەش بەشێکی دیاری کۆمەڵی کوردی پێکدێنن بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەپاڵ خێڵ و عەشیرەتە دیارەکاندا دەژین و لەسەر زەوی ئەوان کاردەکەن و ئاژەڵ و مەڕوماڵاتی ئەوان بەخێو دەکەن.

خاڵی دووەم جوگرافیا دەلالەتێکی مەعنەوی هەیە لە بوونی خێڵ و عەشیرەتداو بۆ نموونە دەبینین خێڵ و عەشیرەتی کوردی بەجۆرێك شانازی بە جوگرافیاو سنووری نیشتەجێ بوونی خێڵەکەیەوە دەکات و وای دەبینێ کە ئەو جوگرافیایە بەشێك لە سەروەری و پیرۆزی ئەم

پێکدێنێت، ئەم تێڕوانینەش یەکێکی تر بووە لە هۆیەکانی بەردەم دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵەکانی کورد بۆ نموونە خێڵێکی ناوچەیەکی گەرمیان شێوازی ژیان و جۆری هەڵس و کەوتکردنی لەگەڵ خاك جیاواز بووە لە خێڵ یان عەشیرەتێکی کوێستانی بەجۆرێك کە نەتوانن پێکەوە هەڵبکەن و هاریکاری یەکتری بکەن.

یەکێك لە هۆیەکانی ئالۆزیو شەڕو ئاژاوەی نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد مەسەلەی جوگرافیای خێڵە. هەر خێڵ و عەشیرەتێکی کورد وەکو یەکەیەکی سەربەخۆی سیاسی ئیداری کۆمەلایەتی سەیری خۆی دەکات و وەهاش لە جوگرافیاو سنووری قەڵەمڕەوی خۆی دەڕوانێت کە سنووری دەوڵەتێك بێت و کەس بۆی نەبێت پێی لێ بنێت. یان گەرمیان و کوێستانی تێدابکات یان بیکات بە لەوەڕگا بۆ ئاژەڵ و مەڕومالاتەکانی یان لە زەوییە دێم و بەراوەکانیدا کشتوکاڵ بکات. هەموو ئەمانە لە داب و نەریتی خێڵایەتی کوردیدا قەدەغەو حەرامن و هەر خێڵ و عەشیرەتێك یان هەر تیرەو هۆزێك پێ بنێتە نێو جوگرافیای خێڵ و عەشیرەتێکی ترەوە یەکێك لەو چالاکیانەی سەرەوە لە سنووری جگرافیای ئەودا ئەنجام بدات ئەوا دەبێتە هۆی ناکۆکی و شەڕو ئاژاوە لە نێوان ئەو دوو خێڵەداو دەشێ ئەنجامی خراپی لێ بکەوێتەوە. کە ئەوەش بە درێژایی مێژ ووی خێڵایەتی کوردی سەرچاوەی پەشێویی و ناکۆکی بووەو بواری هاریکاری و یەکگرتنی تەسك کردۆتەوەو ڕێگر بووە لە بەردەم ڕەخساندنی زەمینەی پێکهاتنی فیدراسیۆنی خێڵەکانی کورددا، دیارە ناسروشتی پەیوەندییەکانی خوێن و دەمار (خزمایەتی) کوردیش لەو بوارەدا دەوری خۆیی بینیووە.

ئێمە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە خێڵ و عەشیرەت وەکو دامەزراوێکی یەکگرتووی بە چەندین رایەڵەی مادی و مەعنەوی پێکەوە بەستراو دروستبووەو لە قەڵایەك دەچێت کە لە هیچ لایەکەوە بۆ بێگانە

رێگـای چوونـه نـاوەوەی نیـه. واتـه سـەرجەم پـەیوەندیو چالاکیـیـه کۆمەڵایەتیەکانی خێڵ له سنووری خۆیدا ئەنجام ئەدرێت. ئەمە شێوەی سروشتی پێکهاتن و پەیوەندییەکانی دامەزراوی خێڵە لەناو خۆیدا بەڵام خێڵـی کـوردی هـەر لـەمێژە جۆرێـك لـه بنـەماکانی یـەکبوونی خۆیـی ونکـردووە. ئەویش بەکاریگـەری تۆپۆگرافیـای نالـەباری کوردسـتان کـه ئەورێکی دیاری بینیووە له دابەشبوونی خێڵ و تیرەکانی خێڵدا بەسەر ناوچەی دور لـه یـەك و داخراودا که ئەوەش جۆرێك لـه کـورت بینـی و داخرانی تێڕوانینی خێڵی کوردی یان تـیرەی کـوردی بـەرووی خۆیـدا دروستکردووەو وەهای لێکردووە که جگه له خۆی کەسی تر نـەبینێ و نـەتوانێت لەگەڵ کەسی تر کۆببێتـەوەو یـەکبگرێت. ئەمـەش لـه ئاکـامدا رێگای له دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵەکانی کـورد گرتـووە. لێرەدا باسـکردنی تۆپۆگرافیـای کوردسـتان و کاریگـەری لەسـەر شـێواندنی پەرەسـەندنی کۆمەڵایـەتی کـورد بـەجێ دەهێڵـین چونکـه باسـێکی سەربەخۆیەو پێشتر به کورتی لێی دواوین(٧).

لـەکاتی نیشتەجێبووندا خێڵـی کـورد بـه کاریگـەری تۆپۆگرافیـای نالـەباری کوردستان ئەو بارودۆخـەی بۆ نەرەخساوە که سەرجەم خێڵ بەهـەموو تیرەکانیەو له ناوچەیـەکی دیـاری کـراودا نیشـتەجێ ببێـت و پارێزگـاری لـه پەیوەندییـەکانی خوێـن و دەمـار (خزمایـەتی) خـۆی بەشێوەیەکی بەهێز بکـات و رایەڵـەکانی پـەیوەندی نێـو هـەرەمی خێـل سەرجەم خێڵ و تیرەکانی پێکەوە ببەستێت. بەڵکو زەوی کشتوکاڵی و ئـاو و لـەوەڕگا خێڵـی کـوردی ناچـار کـردووە هـەر چـەند خـێزان و بنەماڵەیەکی لەسەر ئاوێك و بەدیار رووبەرێکی تەسکی زەوی و پاکژەوە نیشـتەجێ بـبن و وەك یەکەیـەکی ئـابوری و کۆمەڵایـەتی تاڕادەیـەك سەربەخۆیان لێ بێت و لەنێو ئەو چەند خێزانەدا کەسی یەکەم و بڕیـار بەدەست دەرکەوێت و ئەوکەسەش زۆرجار گوێڕایەڵی سەرۆك خێڵ یـان تەنانـەت سەرتیرەکەشـی نـەبێت، بـەوەش سروشـتی پـەیوەندی و

میکانیزمی کارکردن و جوڵەو ئاراستەی فەرمان لە هەرەمی خێڵایەتی کوردیدا شێواوەو هێزو توانای ناوکۆیی خێڵ دابەش بووە بۆ چەندین هێزی بچووك و بەوەش چەندین پنتی دەسەڵات و بڕیار لەناو دامەزراوی خێڵی کورددا دروستبووە کە ئەوەش نفوزو دەسەڵاتی سەرخێڵی کوردی کەمکردۆتەوەو لەم حاڵەتەشدا چ سەرخێڵ و چ دامەزراوەکە لە خەمی یەکخستنی بەشەکانی خودی خێڵدا دەبن و سەرخێڵ دەیەوێت هەر هیچ نەبێت قەوارەی خێڵ بەیەکگرتوویی و وەکو تاکە دامەزراوێك بپارێزێت.

بەڵام دوورکەوتنەوەی تیرەو بنەماڵەکانی هەمان خێڵ لەیەکتری زۆرجار بۆتە هۆی ناکۆکی و ئاژاوەو دوژمنایەتی کردنیش لە نێوان تیرەکانی هەمان خێڵدا. هەر بۆیە خێڵی کوردی جگە لەو کاتانەی کە لەگەڵ خێڵەکانی تردا ناکۆکی هەبووە ئیتر لە حاڵەتی ئاساییدا وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو دەرنەکەوتووە، بەڵکو لە ناوخۆیدا پێکهاتەیەك بووە لە ناکۆکیو ناتەبایی و هەر خێڵە لەناوخۆیدا بەپێی ناکۆکی و جیاوازی تیرەکانی ئاراستەی جیاوازی بڕیاری تێدا دروست بووە کە ئەو فرە ئاراستەیە ڕێگای نزیك بوونەوەی نێوان خێڵە جیاوازەکانی نەداوە چونکە لە جەستەی تاکە خێڵێکدا چەندین ناوەندی بڕیاتر دروستبووەو هیچ کام لەو ناوەندانەش قازانجی لەوەدا نەبووە نە لەگەڵ بەشەکانی تری خێڵەکەی خۆی نە لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتەکانی تردا نزیك بێتەوەو هاریکاری بکات کە تەنیا نزیکبوونەوەو هاریکاری هۆکاری سەرەکین بۆ دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی. چونکە لە عەقڵ و ستراتیژی خێڵایەتی کوردیدا گرنگ ئەوەیە تۆ کەسی یەکەم بیت ئیتر گرنگ نیە رەعیەتەکەت چەندە. ئەم بنیادەی خێڵایەتی کوردی بە ئاشکرا گواستراوەتەوە بۆ نێو حیزبی کوردی و زۆربەی حیزبە بچووکەکان کە لە هەمان شوێنی ئەو چەند خێزانەی گوندێکی سنوور داخراوی پەیوەندی خێڵایەتی کوردین ناتوانن دەست بەرداری ئەو وەهمە بن کە خۆیان بە سەرکردە دەزانن، ئەمان بەلایانەوە گرنگە خاوەنی بڕیارین با سنووری

ئەو بڕیارەش زۆر تەسك بێت وەكو گوتەیەكی عەرەبی كە دەڵێت: یریدون الاماره ولو علی الحجارة).

دروستبوونی ئەو ناوەندانەو دابەش بوونی خێڵی كوردی بەوجۆرە لە ژێر كاریگەری تۆپۆگرافیای كوردستاندا هۆكارێكی سەرەكی بووە كە ڕێگای لە دروستبوون و پێكهاتنی فیدراسیۆنی خێڵایەتی كوردی گرتووە.

ئێمە تاكو ئێستا باسی هەندێ لەو هۆكارانەمان كرد كە ڕێگایان نەداوە فیدراسیۆنی خێڵایەتی كوردی دروست ببێت بەڵام فیدراسیۆنی خێڵایەتیمان نەناساند. مەبەست لە فیدراسیۆنی خێڵایەتی كۆبوونەوەو لێك نزیك بوونەوەو هاریكاری و پەیمان بەستن و دواتر یەككگرتنە لە نێوان خێڵ و عەشیرەتەكانی كۆمەڵگایەكدا بە گشتی یان لە نێوان بەشێك لە خێڵ و عەشیرەتەكانی كۆمەڵگایەكدا كە پێكەوە یەكەیەكی گەورەتر لە ڕووی قەوارەو هێزو ژمارەوە پێكدێنن و سەركردایەتیەكی یەككگرتوویان دەبێت و ئەو سەركردایەتیەش ناوەندی یەكەمی بڕیارو دەسەڵات دەبێت و دەشێ لە ئەنجامی ئەو یەككگرتنەدا ڕۆحی كۆمەڵایەتی ئەو كۆمەڵگایە بە ئاراستەی بڵندبوون بجووڵێت و لە ئاكامدا دەوڵەتی خێڵ لەو كۆمەڵگایەدا بەهەموو بنەماكانی دەوڵەتی خێڵەوە دروست ببێت.

دامەزراوێكی لەو جۆرەش كە نە یەككگرتنەوەی خێڵ و عەشیرەتەكانی كۆمەڵگایەك دروست ببێت ئەوا بێگومان ئەو دامەزراوە لە خێڵ گەورەتر دەبێت و وەكو دامەزراوێكی كۆمەڵایەتی خێڵایەتی خاسیەتی نەتەوەیش هەڵدەگرێت و دەبێتە دەوڵەتی نەتەوەیی ئەو كۆمەڵگا خێڵایەتیە. لە مێژووی كۆنی میزۆپۆتامیادا لە ئەنجامی فیدراسیۆنی خێڵەكاندا كە زۆربەی خێڵەكان بەجیا دەسەڵاتێكی سنووردارایان هەبوو پێیان دەگوت دەوڵەتۆچكەی شار، دەوڵەتی سۆمەری دروستبوو. یان توركە عوسمانیەكان بریتی بوون لە چەند خێڵێكی جۆراوجۆری ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاس لە ئەنجامی هەست كردنیان بە ئائامادەبوون و

لاوازییاندا توانیان یەکبگرن و جۆرێك لە فیدراسیۆن دروست بکەن کە لە ئەنجامدا دەوڵەتی عوسمانیان دروست کـردو ئـەو دەوڵەتـەش بـوو بـە یەکێك لە گەورەترین ئیمپراتۆرەکانی سەردەمی خۆی.

هۆکـارێکی تـری لێـك دورکەوتنـەوەی خێـڵ و عەشـیرەتەکانی کـورد دەگەڕێتەوە بۆ ونیو نادیاری ئەسڵ و سەرچاوەی خێڵ و عەشیرەتەکان خۆیان. تاکو ئێستا توێژینەوەیەکی لەوجۆرە نەکراوە کە پەیوەندی رەگ و ریشەو بنەچەی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد دەربخات، مەبەستمان لەو درەختی بنەماڵانە نیە کە ناتوانرێت بە بەڵگەی زانستی بسەلمێنرێن.

ئەگەر سـەرنجی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد بدەین ئەوا هەریەکە بـە هـەرەمێکی سـەربەخۆ لـە رابـردووەوە بـۆ ئێسـتا کشـاوەو سـەربەخۆیی خۆیی پاراستووەو وەکو یەکەیەکی داخراو خێڵ و عەشیرەتی کوردی بە هەرەمێکی سەربەخۆو دیسان داخراو بەرووی خۆیدا ماوەتەوە ئەوەش وایکردووە دیوارێکی ئەستوور لە نێوان خۆی و خێڵ و عەشیرەتەکانی تردا هەڵبچنێت بە جۆرێك کە پەیوەندی خێڵێکی کورد لەگەڵ خێڵێکی تری کورددا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبێت لە پەیوەندی ئەو خێڵە کوردانە لەگـەڵ خێڵـی نەتـەوەکانی دراوسـێی کوردسـتاندا. تەنـها مەگـەر هاوسنووری جوگرافیای خێـڵ لەگـەڵ جوگرافیـای خێڵـە هاوسـێکەیدا کاریگەرییـەکی هـەبێت لەسـەر شێوازی پەیوەندییەکـە، ئیتر گرنـگ نیـە خێڵی هاوسنور کورد بێت یان غەیری کورد.

لـە رووی رەگ و ریشـەوە تـاکو ئێسـتا نـازانرێت ئایـا خێـڵ و عەشیرەتەکانی کورد لە کوێدا بەیەك دەگەنەوەو دەبنەوە بە کوڕی یەك باوك، ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد هەست نەکەن کە لە ئەسڵدا هەموویان برای یەکترن و یەك رەگ و ریشەیان هەیە چونکە ئەگەر لە روو مەعنەوییەوە خێڵ و عەشیرەتی کوردی هەستیان بکردایە برای یەکترین و ئەوەی یەك کەسن ئەوە دەشیا هەستکردن بەو نزیکیـە ببوایەتـە هـۆی روخـاندنی دیوارەکـانی نێوانیـان و رێگـای

هاریکاریو یەکێتی و یەکگرتن خۆش ببوایەو بەوەش زەمینەی دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد پێکبهاتایە.

درەختی بنەماڵەکان کە بەکاریگەری ئایینی ئیسلام دروستبووەو هەر عەشیرەت و خێڵێك لە هەوڵی ئەوەدا بووە کە پلەیە زووترو نزیکتر خۆی بگەیەنێتەوە بە پێغەمبەری ئیسلام و کەس و کارو هاوەڵانی، لە راستیدا ئەمە لەلایەك دەبێتە بەڵگە بۆ ناکوردێتی ئەو عەشیرەت و خێڵانەی کە ئەو دۆکیومێنتەیان هەیە، لە لایەکی تر خودی ئەو دۆکیۆمینتە بووە بەهۆی ئاژاوەو ناکۆکی لە نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا، چونکە ئەوەی کە پلەیەك نزیکترە لە پێغەمبەر خۆ بە پیرۆزترو بەرزتر سەیر دەکات، خۆ ئەو خێڵ و تیرەو بنەماڵە یان دەستە کۆمەڵایەتیەی کە لە بنەڕتدا خاوەنی ئەو دۆکیومێنتە نیە ئەوا لە تێڕوانینی خاوەنی دۆکیومێنتەکانەوە بە نزم و کەم بەها سەیر دەکرێت و لەو میانەشدا هیچ بوارێك بۆ هاریکاری و یەکگرتنەوە نامێنێتەوە، ئەوەش هۆیەکی تری رێگر بووە لە بەردەم دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردیدا.

لە دەرەوەی درەختی بنەماڵەکان لە پەیوەندی خێڵایەتی کوردیدا ناتوانرێت سەرچاوەیەکی یەکگرتوو بۆ هەموو خێڵ و عەشیرەتەکان بدۆزرێتەوە واتە لە مێژووی دابردوودا لە رووی مەعنەوییەوە، لە رووی دۆکیومێنتێکی ئاشکراوە خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد هیچ بنەمایەکی ئەوتۆی هاوبەشیان نیە. تەنانەت هەندێ جار ناتوانرێت تیرەکانی خێڵێکیش بەتەواوی ببرێنەوە سەر باوکی یەکەمیان و لەگەڵ براکانیدا بگەیەندرێنەوە بەیەك رەگ و ریشەی دیار. بۆ نموونە تاکو ئێستا تیرە دیارەکانی خێڵی جاف لە رووی تۆمار کردنەوە ساغ نەکراونەتەوە کە کوڕی کام باوکن و لە کوێدا دەگەنەوە بەیەکتر. نموونەیەکی زۆر نزیك دەربارەی رەگ و ریشەو ناوی ئەو کەسەی کە میرنشینی سۆرنی دامەزراندووە تاکو ئێستا نەتوانراوە ئاشکرا بکرێت. مێژوونووسەکانی ئەردەڵان هەموویان لەسەر ئەوە یەکن کە بارام بەگی کوڕی سورخاب بەگ کە ئەو زەمانە بە فەرمانی باوکی کراوە بە حاکمی ئامێدی و رەواندز،

باپیرەی زنجیرەی بنەماڵەی میرانی سۆرانەو هەموویان سوورن لەسەر ئەوەی کە میر محەمەدی میری ڕەواندز و هەریر و کۆیە کە لەو سەردەمەدا یەکێ لە پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە بووە لە نەوەی بارامی کوڕی سورخابە. (بەڵام) ئاگاداریەکانی شەرەفنامە کە کۆنترین سەرچاوەی مێژوویییە باسی بنجوبناوانی هەردو بنەماڵەی ئەردەڵان و سۆرانی کردبێ لەم ڕووەوە هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نادا، کە بارام بەگ باپیری میرانی سۆران بێ(٨).

ئەمەش بنەمایەکی لاوازی دامەزراوی خێڵ و عەشیرەتی کوردییە کە تاکو ئێستا زۆرشت لە بارەیەوە بە نهێنی ماوەتەوەو تاکو ئێستاش ئەم دامەزراوە دەوری کاریگەرو ئامادەبوونی لەبەرچاوی هەیە لە کۆمەڵگای کوردیدا. لەبەرئەوەی خێڵ و عەشیرەتی کوردی نە ڕەگ و ریشەی بە باشی دیارە، نە دەزانرێت لە کوێدا پێك دەگەنەوە.. لە مێژووی رابردووشەوە بۆ ئێستا نەیانتوانیووە لە یەکتر نزیك ببنەوەو هەوڵی دروستکردنی فیدراسیۆنی خۆیان بدەن و لە یەکێتییەکی گەورەترو فراوانتردا کۆببنەوەو سیمای نەتەوایەتی بەخۆیان بێن و لە ئاکامیشدا دەوڵەتی خێڵایەتی کوردی دروست بکەن.

خاڵێکی تر کە دەشێ وەکو یەکێك لە هۆکارەکانی بەردەم دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردی سەیر بکرێن مەسەلەی گەرمیان و کوێستان و پەیوەست نەبوونە بە خاك و بە ئابوری خاکەوە، خێڵی کۆچەری هەمیشە وا دەردەکەوێت کە پێویستی بەو جۆرە هاریکاری و یەکگرتنە نیە لەگەڵ خێڵەکانی تردا کە ببێت بە بنەما بۆ دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵەکان، چونکە فیدراسیۆن وەکو جۆرێك لە یەکگرتن و پەیمان بەستن دەبێت. لەسەر (شوێن) واتە زیاتر لە حاڵەتی سەقامگیربووندا دروست دەبێت. خێڵی کۆچەری لەسەر بنەمای (شوێن) پێناسە ناکرێت، هەر لەبەرئەوە ناتوانرێت لە ژیانی کۆچ و گەرمیان و کوێستاندا باسی فیدراسیۆنی خێڵایەتی بکرێت بەو چەمکە بۆچوونەی کە فیدراسیۆن دەبێت بەهۆی دروستکردنی دەوڵەتی خێڵ.

له لایەکی ترەوە فیدراسیۆن بەبێ ئاوەدانیو ئاوەدانکردنەوە دروست نابێت. هەروەك ئیبن خەلدونیش دەڵێت: سەقامگیرو نیشتەجێ بوون لە مەرجە سەرەکییەکانی ئاوەدان کردنەوەن(٩). ئەوەدانکردنەوەش یەکەمجار لە سنووری خێڵ و عەشیرەتی نیشتەجێوە دەست پێدەکات و لەوێشەوە دەکشێت بۆ سنوری یەکێتی خێڵ و عەشیرەتەکان واتە دەشێ ئاوەدانکردنەوە ببێت بە کارکەرێکی یارمەتی دەری پێکهاتنی فیدراسیۆن خێڵەکان. بەڵام خێڵی کۆچەری کوردی ناتوانێت ئەو زەمینەیە ئامادە بکات چونکە سەقامگیر نیە. واتە لە ئەنجامی ژیانی گەرمیان و کوێستاندا خێڵی کۆچەری کوردی یەکێکی تر لە هۆیەکانی نزیکبوونەوەی نێوان خۆی و خێڵ و عەشیرەتەکانی تری ونکردووە کە ئەویش ئاوەدانکردنەوەی شوێنە، ئەو شوێنەی دەشێ ببێت بە زەمینەی پێکهێنانی فیدراسیۆنی خێڵەکان. جارێکی تر ئیبن خەلدون دەڵێت: کۆبوونەوەی مرۆڤ پێکەوە شتێکی پێویستەو مرۆڤ بە سروشتی بوونەوەرێکی مەدەنیە لەبەر ئەوە دەبێ کۆبوونەوە هەبێت و خودی ئەو کۆبوونەوەیەش بریتی‌یە لە لەمەدەنی بوون کە مەبەست لەمیش ئاوەدانکردنەوەیە(١٠). لێرەوە دەردەکەوێت کە مرۆڤ بەبێ کۆبوونەوەو نیشتەجێ بوون ناتوانێت ئاوەدانکردنەوە بکات بێ ئاوەدانکردنەوەش ناشێ نزیکی لە نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا پێکبێت، لە حاڵەتێکی وەهاشدا ناشێ زەمینە بۆ پێکهاتنی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد برەخسێت.

بەهەرحاڵ لە مێژووی خێڵایەتی کوردی‌دا چ لەنێو خێڵی کۆچەری خۆیان بەتەنهاو چ لەنێو خێڵ و عەشیرەتە دانیشتووەکاندا، نە لە نێوان کۆچەری و دانیشتووەکاندا پێکەوە هاریکاری و یەکگرتنێکی ئەوتۆ دروست نەبووە کە ببێتە بنەما بۆ دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردی چونکە لە زەمینەیەکی وەها ئاڵۆزدا کە بنەماکانی ئاوەدانکردنەوە بوونی نەبێت فیدراسیۆن لەسەر زەمینەی بۆش دروست نابێت.

# ئابوری خێڵ و دەوری لە دواخستنی دروستبوونی فیدراسیۆندا

پێشتر گوتمان ژیانی خێڵایەتی کوردی ژیانێکی سادەو نیمچە سەرەتایی بووە بەتایبەتی ژیانی خێڵی کۆچەری کوردی کە هەموو پێداویستییەکانی ژیانی لە سنوری دامەزراوەکەی خۆیدا دابین کردووە کە ئەویش بریتی بووە لە بەروبوومی ئاژەڵ، کشتوکاڵیش تەنیا لە حاڵەتی نیشتەجێ بووندا دەکرێت بۆیە خێڵی کۆچەری نەیتوانیووە کشتوکاڵ بکات مەگەر بەرهەمەکانی ئاژەڵداری گۆڕیبێتەوە بە بەرهەمە پێویستییەکانی کشتوکاڵ. لە بارەی ژیانی ئابوری کوردەوە شەرەفخانی بەدلیسی دەڵێت: خاکی کوردستان بە لوڕستانیشەوە بەشی زۆری ڕەقەن و چڕو لێڕەوارەو نەرمانی ئەوەندە نیە کە بەرهەم و دەرامەتی کشتوکاڵی دانیشتوانی هەموو بە تەسەل تێر بکا، سەبارەت بە ڕژدو کراڵی زەوی و زارەکەیان کورد لەچاو دەرو دراوسێکانیان هەژارو نەدارن(١١).

ئەمە سەرچاوەی سروشتی و گشتی ئابوری کورد بووە لە رابردوودا و خێڵی کورد لەسەر ئەو ئابورییە ژیاوە بەتایبەتی خێڵی کۆچەریش کە هەموو ژیانی لەسەر ئاژەڵداری بووە ئەو حاڵەتە وایلێکردووە بەردەوام لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتەکانی دەوروبەریدا ناکۆك و ناتەبا بێت و لە ئاکامدا خێڵ وەکو دامەزراوێکی گۆشەگیرو دابڕاو لە دەوروبەرەکەی دەرکەوتووەو هەموو پەیوەندی و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی لە

سنووری خۆیدا بووه. ئەوەش سنووری خێڵی بەرووی خۆیدا داخستووەو نەیتوانیووە لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتەکانی تردا تێکەڵاو ببێت و لە ئاکامدا هاریکاری و یەکگرتن دروست ببێت و زەمینە بۆ پێکهاتنی یەکگرتنەوەی فراوانتری خێڵەکان لە شێوەی فیدراسیۆندا بڕەخسێ.

لەلایەکی ترەوە ئابوری خێل بەگشتی بەشێکی بریتی بووە لە تالان و داگیرکردن و بردنی مەڕومالات و سامانی ئەو خێڵ و عەشیرەتانەی کە شەڕی لەگەڵدا کردون، یان ئەو سامانەی لەبری خوێندا وەریگرتوە. لێرەوە دەردەکەوێت کە سەرچاوەی ئابوری خێڵی کوردی سەرچاوەیەکی ناجێگیرە. دیارە بنیادی ئابوریش دەورێکی کاریگەری هەیە لەسەر پێکهێنانی بنیادی عەقڵی و فیکری و داب و نەریت و رەفتار. هەر بەوپێیە ئابوری خێڵایەتی کوردی نەیتوانیووە دەورێکی پۆزەتیف ببینێ لە فۆرمەلە کردنی عەقڵ و ستراتیژی خێڵایەتی کوردیدا بە ئاراستەی کرانەوەو هاریکاری و یەکگرتن. بەڵکو ئەو شێوازەی ئابوری خێڵی کوردی لێوە بەرهەم دێت رێگاخۆشکەرە بۆ پەرتبوون و لێکدوورکەوتنەوە چونکە بەشێوەیەکی گشتی ئابوری خێڵ و سامانی خێڵ لە دژایەتی کردن و نەیاربوونی خێڵ و عەشیرەتەکانی ترەوە دروست دەبێت و خێڵ لە پێناوی ئەو داهاتەدا ماف و سەروەری خێڵەکانی تر پێ لێدەنێت، دیارە پێنان لە کەرامەت و سەروەریەکانی خەڵکی یان دامەزراوی خێڵێکی تر دەبێتە مایەی ئاژاوەو ناکۆکی و ئاشکراشە کە هەموو جۆرە ئاژاوەو ناکۆکیەك لە نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا بە دژی یەکگرتن و دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردی بووە.

بە گوێرەی فاکتەری ئابوری لە قۆناغی نیشتەجێ بوون یان نیشتەجێکردنی خێڵی کوردیدا دەورێکی کاریگەری بینیووە لە زیاتر لاوازکردنی رۆحی یەکگرتن و لێك نزیك بوونەوەی خێڵ و عەشیرەتەکانی

کـورددا. لـەو قۆناغـەدا هۆکـاری ئـابوری زیـاتر یـەکێتی خێڵـی هەڵوەساندۆتەوەو نەك هەر بۆتە هۆی زیاتر گۆشەگیرکردنی خێڵەکان و دوورخستنەوەیان لە یەکتری بەڵکو زۆربەی کات تیرەو بنەماڵەکانی تاکە خێڵێکـی دیـاری کراویشـی لەیـەکتر پـەرت کـردووە چونکـە لـەکاتی نیشتەجێ بووندا خێڵ و تیرەو بنەماڵەکانی پێویستیان بە ئـاوو زەوی کشـتوکاڵی و لەهـەمان کـاتدا لـەوەڕگاش هـەبووە، بـەڵام تۆپۆگرافیـای ناڵەباری کوردسـتان ڕێگـای نەداوە هـەر خێڵە بـەخۆیی و هـەموو تـیرەو بنەماڵەو هەموو ئەوانەی تریش کە بوونەتە لایەنگری و لەگەڵیدا دەژین لـە پانتاییـەکی جوگرافیـای دیـاری کـراودا نیشـتەجێ بـبن و زەوی کشتوکاڵ و ئاوو لەوەڕگایان وەکو پێویست هەبێت بەڵکو بە پێچەوانەوە لەبـەر کـەمی زەوی کشـتوکاڵ و ئـاوی پێویسـت خێڵـی کـوردی لـە نیشتەجێبووندا دابەشبووە بەسەر چەند کانیو کارێزو سەرچاوەیەکی ئاوداو هەر تیرەو بنەماڵەیەکی خێڵ لە چەندین شوێن نیشتەجێ بوون و بەوەش یـەکێتی خێـڵ لاواز بـووەو هـەر تـیرەو بنەماڵەیـەك بـیری لـەوە کردۆتەوە کە خۆی چۆن و بە چ شێوەیەك ژیانی خۆی دابین بکـات. هـەر ئەو دابەشبوونەش لە پێناوی ژیاندا زۆربەی کات بووە بە هۆی نـاکۆکی نێوان تیرەو بنەماڵەکانی هـەمان خێڵ کە هاوسنوری یەکتربوون لەسەر پاکژو لەوەڕگا. ئەم دابەشـبوونە یەکێتی خێڵی لاواز کـردووەو بـەوەش پـەیوەندی خوێـن و دەمـار (خزمایـەتی) بـەرەو لاوازبـوون چـووەو لـە جەسـتەی خێڵـی کـوردیدا جـۆرە دەزبردنێـك دروسـتبووە کـە لەگـەڵ ڕۆیشتنی کاتدا بەتەواوی بەشەکانی خێڵی لێکتر جیاکردۆتەوە و مەگـەر تـەنیا لـە ساتەوەختی مەترسـی دەرەکیـدا بەشـە جیاوازەکـانی خێـڵ هەستیان بە پێویستبوونی یەکێتی و یەکبوونی خۆیان کردبێت ئەویش لە پێنـاوی مانەوەدا. ئـەم دابەشـبوونە لـە جەسـتەی تاکـە خێڵێکـدا جوڵەیـەکی بـە پێچەوانـەی ئاراسـتەی بەرەوە یـەکبوون و هاریکـاری و یەکگرتن لەگەڵ خێڵەکانی تردا دروستکردووەو هـەر خێڵـە لـە هـەوڵی

ئەوەدا بووە بەشەکانی خۆی یەك پێ بگرنەوە. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی خێڵی کورد لەوەشدا سەرکەوتوو نەبووەو زۆربەی کات تیرەکانی هەمان خێڵ لەناو یەکدا ناکۆك و ناتەبابوون. لە ئەنجامی ناڕێکیو پەشێوی لەنێو جەستەی خێڵەکان خۆیانداو هەوڵدانیان بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکیە ناوخۆیانە زۆرجار ململانێ و ناکۆکیە ناوکۆییەکانیان فرێدراوەتە دەرەوەی خۆیان و بەگژ خێڵ و عەشیرەتە هاوسنوورەکانیاندا چوون و بەوەش ئاژاوەی نێوان خێڵەکان زیاتر پەرەی سەندووەو بوار بۆ لێکتر نزیك بوونەوەو هاریکاری و رەخساندنی زەمینەی دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵەکانی کورد نەماوەتەوە. واتە شێوازی نیشتەجێ بوونی خێڵی کوردی بەکاریگەری زەمینەی نالەباری تۆپۆگرافیای کوردستان نەك هەر نەبۆتە هۆ بۆ رەخساندنی هەلومەرجی لێك نزیك بوونەوەو دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردی بەڵکو بۆتە هۆی زیاتر پەرتکردنی جەستەی خێڵ خۆی و ئاژاوەو ناکۆکی خێڵایەتی کوردیش لە بنەڕەتدا بەشێکی پەیوەندی بەو تۆپۆگرافیا نالەبارەو گرانیو زەحمەتی بەدەست هێنانی پێویستییەکانی ژیانەوە هەیە تیایدا.

ئەم دابەشبوونەی جەستەی خێڵیش لەژێر کاریگەری و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دابەشبوونی چینایەتیدا نەبووە بەجۆرێك کە لە نیشتەجێ بووندا هێڵی جیاکردنەوەی نێوان توێژو چینە کۆمەڵایەتیەکانی ئەو قۆناغە بکێشرێت بەتایبەتی سنووری جیاکەرەوە لەنێوان جوتیاران و خاوەن مڵکەکاندا تەواو ئاشکرابێت و ململانێی چینایەتی لە نێوان ئەو دوو چینەدا ببێتە ململانێی سەرەکی و پلەیەك و بەسەر پەیوەندییەکانی خوێن و دەمار (خزمایەتی)دا بپەڕێتەوەو جوتیاران وەکو چینێکی کۆمەڵایەتی خاوەن بنەمای چینایەتی دەرکەوتنایەو وەکو یەکەیەکی کۆمەڵایەتی کە بنەمای چینایەتی و پەیوەندی چینایەتی تیایدا بەسەر سنورەکانی خێڵدا بپەڕیایەتەوەو بنەمای ئابوری

چینایەتی ببوایەتە فاکتەری یەکگرتن و فۆرمەلە کردنی ئەو چینەو جێگای بە پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی چۆڵ بکردایە. ئەگەر رەوتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا بەوشێوە سروشتیە بڕۆیشتایە ئەوا دەشیا لەبری چاوەڕوانکردنی پێکهاتنی فیدراسیۆنی خێڵەکان و پێکهێنانی دەوڵەتی خێڵایەتی کوردی لەو قۆناغەدا چاوەڕوانی پێکهاتنی دەوڵەتی فیودیالی کوردی یان دەوڵەتی جوتیاری کوردی بکرایە. دیارە ئەگەر مێژووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردی بەو ئاراستەیان بڕۆیشتایە ئەو، کۆمەڵگەی کوردی لە پەیوەندی ئاڵۆزو پڕ لە پەشێویی و ناکۆکی خێڵایەتی دەگوازرایەوە بۆ یەکەیەکی گەورەترو بەهێز کە ئەویش دامەزراوی دەوڵەتی فیودیالی دەبوو، ململانێش لە نێوان سەرجەم جوتیاران و ئەو دەوڵەتەدا دەبوو. لە حاڵەتێکی وەهاشدا هەموو تواناو وزەی کوردی بە چین و توێژو خێڵ و عەشیرەتەکانیەوە بە فیڕۆ نەدەچوو، لەنێو جەستەی خۆیدا هەموو تواناکان خاڵی نەدەکرانەوە.

ئەگەر سەرنجی خێڵی کوردی بدەین لە قۆناغی گەرمیان و کوێستانیەوە بۆ قۆناغی نیشتەجێ بوونی ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە لە نێوان ئەو دوو قۆناغەدا هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ نیە یان دروستنەبووە کە لە روانگەی کۆمەڵناسیەوە بتوانین بە (دابڕان) ناوی ببەین چونکە نە لە بنیادی پێکهاتنی کۆمەڵ و نە لە سەرخانی کۆمەڵدا گۆڕانکاری رووی نەداوە، بەڵکو هەر ئەوەیە خێڵ ولزی لە کۆچ هێناوەو بەهەموو داب و نەریت و عەقڵ و ستراتیژی پێشترییەوە نیشتەجێ بووە. هەرچۆن ئێستا دەبینین هەمان خێڵ و هەمان گوندنشین بەخۆیو هەموو سیفاتەکانی ژیانی دەرەوەیی و بەهەموو عەقڵ و داب و نەریتێکی لادێیەوە هاتۆتە شارو هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نایەت، کەواتە ئەوە ئاشکرایە کە کۆمەڵگای کوردی لە ژیانی کۆچەری و خێڵایەتی نیشتەجێ لە لادێ و لە گواستنەوەشیدا بۆ شار هیچ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە

که شایانی باس بێت و بووبێته هۆی لاوازکردنی ستراتیژو عەقڵی تاکرەو و گۆشەگیرانەی خێڵایەتی و رێگای بۆ یەکبوون و هاریکاری و یەکگرتن خۆشکردبێت و لە ئەنجامی ئەوەشدا زەمینە بۆ پێکهاتنی فیدراسیۆن یان یەکێتی خۆشکردبێت. لە بارەی گواستنەوەی کۆمەڵگای خێڵایەتی عەرەبەوە لە قۆناغی پێش ئیسلام بۆ قۆناغی دەرکەوتنی ئیسلام دکتۆر محەمەد عابد جابری دەڵێت: کەس گومانی لەوە نیە کە بارودۆخی (ژیانی) عەرەب لە دوای دەرکەوتنی ئیسلام وەکو پێش ئیسلام نەمایەوە(١٢). هەروەها دەڵێت: ئایا گۆڕانکاری قوڵ و گشتگیر لە کۆمەڵگای خێڵایەتی داخراوەوە کە کۆمەڵگایەکی بێ دەوڵەت و بێ یاسابوو روویدا بۆ کۆمەڵگایەکی گەورەی کراوە(١٣). ئەگەر لە روانگەی گۆڕانکارییەوە سەرنج لەو قۆناغە بدەین ئەوا کۆمەڵگای عەرەبی زۆر گۆڕانکاری گەورەی بەسەردا هاتووە. بەڵام با بگەڕێینەوە بۆ نێو کۆمەڵگای کوردی لە (کۆچەوە بۆ نیشتەجێ بوون) لە (لادێوە بۆ شار). ئایا هیچ گۆڕانکارییەکی لەبەرچاو روویداوە؟ بێگومان بەبێ هیچ دوودڵیەکەوە دەتوانین بڵێین نەخێر چونکە کاتێ خێڵی کۆچەری کوردی نیشتەجێ بووە یان نیشتەجێ کراوە نە لە ئەنجامی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردیدا بووە، نە دیاردەیەکی لەبەرچاو یان پرۆژەیەکی وەکو ئیسلام لای عەرەب بۆ کوردیش دەرکەوتووە تا ژیانی خێڵایەتی کوردی لە هەموو رووەکەوە بگۆڕیایە.

لە نیشتەجێ بووندا خێڵی کوردی، بە هەموو سیفات و خاسێت و بنەماو بنیادەکانیەوە وەکو خۆی ماوەتەوەو هەمان سروشتی داخراوی خۆیی پاراستووەو یاساو ستراتیژی پێشتری خۆیی پەیرەو کردووەو پارێزگاری لێکردووە، ئەو ستراتیژەی کە تەنها شەرعیەت بە خودی خێڵەکەی خۆی دەدات و ئەوانی تر نابینێ. یاسای خێڵیش یاسای خۆژیاندنە بەهەر شێوەیەک بێت واتە خێڵی کوردی بڕوای بەوە هەبووەو پەیڕەوی ئەو ستراتیژەی کردووە کە (نانی) لە نوکی خەنجەرکانیدایە،

هەرچۆن ئیبن خەلدون بڕوای وابوو نانی خێڵی عەرەب لە نوکی شمشێرەکانیاندایە. لە پێناوی بەدەست هێنانی ئەو نانەشدا خێڵی کورد دەبێ خەنجەرەکانیان بەکاربهێنن، دیارە ئەم ستراتیژەو شێوازی پیادەکردنی بەتەواوی دژو پێچەوانەی هاریکاری و یەکێتی و یەکبوونی خێڵەکانی کوردە، بە واتایەکی تر ژیانی ئابوری خێڵایەتی کوردی یەکێك بووە لە بەربەستە هەرە سەرەکیەکانی بەردەم دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردی و بەو پێیەش بەربەست بووە لە بەردەم دروستبوونی دەوڵەتی خێڵایەتی کوردیدا.

# شەرەفی خێڵ و چەمکی یەکگرتن

لە کوردەواریدا کاتێ وشەی (شەرەف)مان بەرگوێ دەکەوێت راستەوخۆ خەیاڵمان بەلای مەسەلەکانی ئەخلاقدا دەچێت بەلام لە روانگەی عەقڵ و تێڕوانینی خێڵ و عەشیرەتی کوردەوە شەرەفی خێڵایەتی مەوداو رەهەندێکی فراوانتری هەیەو سەرجەم ئەخلاق و کەرامەت و پیاوەتی و خانەدانی و شوێنی مەعنەوی خێڵ و کەسیەتی خێڵ دەگرێتەوە. واتە سەرجەم ئەو خاسیێت و بنەمایانەی کە دەبنە هۆی بەرزکردنەوەو بەرز راگرتنی شوێنی خێڵ بریتین لە شەرەفی خێڵ. هەموو ئەو هەڵس و کەوتانەی، هەموو ئەو رەفتارانەی کە دەبنە هۆی شەرمەزاری و مل کەچیو روو زەردی خێڵ چ ئەخلاق و چ دۆڕاندنی شەڕو سەنگەربازی و مل کەچکردنی خێڵ بۆ خێڵێکی تر یان داگیرکردنی جوگرافیای خێڵ یان کوشتنی پیاوێکی خێڵ لە لایەن خێڵ و عەشیرەتێکی ترەوە و نەتوانینی تۆڵە سەندنەوەی.. سەرجەم ئەمانە بریتین لە سوکایەتی کردن بە شەرەفی خێڵ. هەربۆیە هەموو خێڵ و عەشیرەتەکان بەهەموو شێوەیەك هەوڵدەدەن پارێزگاری لە شەرەفی خێڵایەتی و عەشیرەتایەتی خۆیان بکەن و تەنانەت بەخوێن و سەری خۆیان هەوڵدەدەن ئەو شەرەفە بپارێزن. زۆربەی کات خێڵ وا هەست دەکات خۆ دوور گرتن لە خێڵ و عەشیرەتەکانی تر رێگایەکە بۆ پاراستنی شەرەفی خێڵ کە ئەوەش بە ئاراستەی پێچەوانەی دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتیە.

له لایەکی ترەوە لە عەقڵ و کۆنەستی خێڵایەتی کوردیدا ئەوە جێگیرە کە تەنیا ڕێگا نەدان بە تێکەڵاو بوون و پەیوەندی نزیك لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتەکانی تردا سنوری خێڵ دەپارێزێ و بەوەش نە کەسی لاوەکی دەتوانێت پێ بنێتە نێو سنوری خێڵەوە نە کەس دەتوانێ پێ لە پیرۆزی و سەروەرییەکانی خێڵ بنێت ئەگەر سنووری خێڵ بەرووی دەرەوەدا داخراو بوو، بە واتایەکی تر لە عەقڵ و ستراتیژی خێڵدا هەموو پەیوەندییەکان لە سنووری داخراوی خێڵ خۆیدا دەکرێت کە ئەویش هەمان سروشت و ماهیەتی پەیوەندی خێزانی هەیە بەڵام لە قەوارەیەکی گەورەتردایە. دیارە ئەندامانی خێزانیش وەك یەك جەستە دەڕواننە خێزانەکانیان و هەموویان دەیانەوێت شەرەف و سەروەرییەکانی بپارێزن.. پەیوەندییە خێزانییەکان لە سەر بنەمای هاریکاری و ئاڵوگۆڕی خزمەت دادەمەزرێن و داخستنی یەکەکانی کۆمەڵگای خێڵایەتی بەرووی خۆیدا ئەو پەیوەندییە خێزانیانەی زیاتر چەسپاندووە(١٤). ئەو داخستنەش لەلایەك ترس لە روخاندن و ناشیرین کردنی پیرۆزی و شەرەفمەندییەکانی خێڵ دروستی کردووە لەلایەکی ترەوە ئەو عەقڵ و ستراتیژەی خێڵ دروستی کردووە کە خۆی لە هەموو خێڵ و عەشیرەتەکانی تر پێ لە پێش ترەو وا لە خۆی دەڕوانێت کە ئەم لە سەروی هەموو ئەوانی ترەوەیەو ئەوانی تر مافی ئەوەیان نیە خۆیان لە ئاستی ئەمدا دابنێن.

ئەم تێڕوانینەی خێڵ و عەشیرەت بۆ پاراستنی شەرەف و کەسێتی هۆی بۆتە خۆی دروستکردنی دیوارێکی ئەستوور بە دەوری خێڵ و عەشیرەتی کوردیداو بواری بۆ هاریکاری و یەکگرتن و یەکێتی نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد نەهێشتۆتەوەو بەوەش بواری دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد نەڕەخساوە چونکە هەر خێڵ و عەشیرەتێکی کورد بڕوای وابووە بوون و مانەوەو سەربەخۆبوونی تەنیا بەوە بەدی دێت کە خۆی لە تێکەڵاوبوونی خێڵ و عەشیرەتەکانی تر بپارێزێت، تەنانەت بە دەگمەن ژن و ژن خوازیش لە نێوان خێڵ و عەشیرەتە جیاوازەکاندا دروستبووە.

# دەوری سەرخێڵ لە دوورخستنەوەی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردیدا

سەرخێڵ یان سەرۆکی عەشیرەت لە کوردەواریدا ئەو کەسەیە کە بەرپرسی راستەوخۆی رێکخستن و بەڕێوەبردنی خێڵ یان عەشیرەتەکەیەتی و تێکڕای بڕیار لە سنوور خێڵ یان عەشیرەتدا لە دەستی ئەودایە. بە واتا ئەو کەسی یەکەمی ئەو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەو خۆی لە لوتکەی ئەو هەرەمەدایە. سەرخێڵی ژیرو وریا دەتوانێ دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکەی بە شێوەیەکی ژیرانە بەڕێوەببات و لە شەڕو ئاژاوەی دەرەکی و ناوخۆ دووری بخاتەوەو ژیانێکی هێمن و پڕ لە ئاسودەیی بۆ خێڵ یان عەشیرەتەکەی دەستەبەر بکات. بە پێچەوانەشەوە سەرخێڵ و سەرۆک عەشیرەتی نەزان و نەگونجاو دەبێتە هۆی شەڕو ئاژاوەو ماڵوێرانی بۆ ئەندامانی خێڵ و عەشیرەت و ژیانیان لێ تێکدەدات. لە پاڵ ئەم دوو بۆچونەدا سەرخێڵ یان سەرۆک عەشیرەت لەبەرئەوەی هەمیشە خۆی خاوەنی بڕیارە لە سنووری جوگرافیاو دەسەڵاتی خۆیدا بە ئاسانی ناتوانێت هاریکاری لەگەڵ سەرخێڵ و سەرۆک عەشیرەتەکانی تردا بکات و راوبۆچوونی ئەوان بەسەر راوبۆچوونی خۆیدا فەرز بکات، بەڵکو هەر سەرخێڵ و سەرۆک عەشیرەتێك لەهەر نزیك بوونەوەیەك لە خێڵ و عەشیرەتەکانی تردا دەیەوێت راوبۆچوون و بڕیاری خۆی بسەپێنێ و مل دان بۆ راوبۆچوون و بڕیاری سەرخێڵ و عەشیرەتێکی تر بە نەنگی دەزانێ و پێی وایە

سوکایەتی کردنە بە خۆی و بە خێڵ و عەشیرەتەکەی بۆیە سەرخێڵی کورد نەیتوانیووە سەوداگەری لەسەر راوبۆچوون و بڕیارەکانی بکات یان پەسەندی ئەوە بکات کە لەگەڵ چەند سەرخێڵێکی تردا یەکبگرێت و یەکێك لەو سەرخێڵانە بە سەرۆکی هەموویان دابنێن، کە ئەوەش بنەمای دروستوبونی فیدراسیۆنی خێڵایەتیە. رازی نەبوونی سەرخێڵ و سەرۆك عەشیرەتی کوردی بە دانانی هیچ سەرخێڵ و سەرۆك عەشیرەتێکی تر لە سەرووی خۆیەوە بووەتە ئاستەنگێکی تر لە بەردەم دروستوبونی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا. نموونەیەکی زیندووی لەبەرچاو ماوەی چەند ساڵێکە لە کوردستان شێخ و سەیدەکان دەیانەوێت یەکێتییەك دروست بکەن بەڵام تاکو ئێستا ناتوانن لەسەر ئەوە رێك بکەون کە کێ یان کام شێخ ببێتە سەرۆکی ئەو یەکێتییە کە بریتییە لە فیدراسیۆنێکی سنووردار. دەتوانین ئەم نموونەیە بکەینە بەڵگەیەکی زیندو بۆ خۆویستی و خۆپەرستی سەرخێڵ و سەرۆك عەشیرەتی کورد کە لەمەر هەوڵێکی یەککگرتن و یەکبووندا خۆی کەسی یەکەم نەبووبێت ئاستەنگی لە رێگای دروستبوونی ئەو یەککگرتن و یەکبوونەدا دروستکردووەو لێی کشاوەتەوە. ئەمەش هۆکارێکی ئاشکرای رێگر بووە لە بەردەم دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا.

# دەوری ئایین لە دوورخستنەوەی فیدراسیۆنی خێڵایەتی کوردیدا

ئـایین بـۆ عـەرەب هـەر لـە سـەرەتاوە پـەیامی یـەکبوون بـووەو توانیوویـەتی بەسـەر هـەموو پەیوەندییـەکانی خێڵایـەتی عـەرەبیدا بپەڕێتـەوە و نەك هـەر بنەمای فیدراسیۆنی خێڵایـەتی عەرەبی دابنێـت، بەڵکو سەرجەم خێڵەکانی عـەرەبی لـە سایەی خۆیـدا کۆکردۆتـەوە بـە تایبەتی لەبەر ئەوەی ئایینی ئیسلام بووە بە بنەمای ئیدارەو نەك هـەر ئایینی دەولەت بووە بەڵکو دەولەتی ئایینی بۆ عەرەب دروستکردووە.

بە گوێرەی کورد ئێمە ناگەڕێینـەوە بـۆ ئـەوەی کـورد چـۆن بـووە بـە ئیسلام بەڵام ئەوەی لامان ئاشکرایە پەیامی ئیسلام بۆ کورد نـەك هـەر نـەبووە بـە بنـەمای یـەکبون بـەڵکو هۆکـارێکی سـەرەکی پـەرتبوون و دابەشبوون بووە لە کۆمەڵگای کوردیدا(١٥). دابەشبوونی کورد بەسەر دوو مەزهـەبی جیاوازی سونەو شیعەدا هۆی سـەرەکی ئـەو پەرتبوونـە بووە. نەك کورد لە سایەی ئەم دوو مەزهەبەدا نـەیانتوانیووە کۆببنـەوە بەڵکو بەکاریگـەری ناکۆکی نێوان ئەو دوو مەزهەبە کوردیـش بـوون بـە نـەیارو دوژمنـی یـەکتر. لـەم بارودۆخەشـدا وەك دەزانـین بەشـێك لـە خێڵکانی کورد بوون بە سونە مەزهەب و بەشێکی تریش بوون بە شیعە کە ئەوەش وایکردووە هیچ بوارێك بۆ دروستبوونی فیدراسیۆن لە نێوان ئەو خێڵانەدا نەمێنێتەوە. هەروەها لە لایەکی ترەوە هەندێ لە کوردەکان

هەڵگری ئاینی یەزیدی و هەندێ جولەو هەندێکی تریش هەڵگری ئاراستەو ئایینە جۆراوجۆرەکانی تر بوون وەکو کاکەیی و عەلی ئیلاهی دواتریش دابەشبوونی زۆرێك لە خێڵ و عەشیرەتەکان بەسەر تەریقەتەکانی تەسەوفدا.. سەرجەم ئەم دابەشبوونانە رێگایان لە هاریکاری و یەکگرتن و یەکبوونی کورد گرتووەو بەوەش زەمینەی پێکهاتنی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد نەرەخساوە چونکە ئەو مەزهەب و ئاینزاو تەریقەتانەی تەسەوف بەگشتی لەگەڵ یەك ناکۆك و ناتەبا بوون.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە گەلێك هۆکار لە مێژووی کورددا بوونەتە بەربەست لە رێگای پێکهێنانی فیدراسیۆنی خێڵ و عەشیرەتەکانی کورددا و هەر بەوپێیەش کورد لە رابردوودا هەلی دروستبوونی ئەو فیدراسیۆنەو بەوپێیەش هەلی دروستکردنی دەوڵەتی خێڵی لە دەست چووە کە کاریگەری ئەو لە دەست چوونەش ئەوەیە کە تاکو ئێستا کورد بەبێ دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی ماوەتەوە.

سەرچاوەکان:

١-الدكتور علي الوردي- دراسة في طبيعة المجتمع العراقي- انتشارات المكتبة الحيدرية ١٩٦٤- ص٨.

٢-تيودور فون اىرنو- محاظرات في علم الاجتماع- ترجمة: جورج كتوره- مركز الانماء القومي- ص ٢٧.

٣-ابن خلدون -المقدمة - دار الجيل- ص ١٤١.

٤-الدكتور محمد عابد الجابري- العصبية و الدولة- بغداد- ص ٢٥٢.

5-Martin Van Brunessen- Agha, Shaikh and State- Zed Books. P. 51.

٦-مەلا عبدالکریمی مدرس- یادی مەردان- بەرگی یەکەم- مەولانا خالید- ١٩٧٩- ل٧.

٧-ڕێبازی نوێ- ژماره (٨)- ڕۆڵی تۆپۆگرافیا له شێواندنی مێژوودا- عەتا قەرەداخی.

٨-نەوشیروان مستەفا ئەمین- له پەراوێزی مێژووی ئەردەلاندا- سلێمانی- ١٩٩٩.

٩-الدكتور محمد عابد الجابری- العصبية و الدولة- ص ٢٢٠.

١٠-ابن خلدون- المقدمة- دار الجيل- ص ٤٦.

١١-شەرەف خانی بەدلیسی - شەرەفنامە- وەرگێڕانی هەژار- ل ٣٧-٣٨.

١٢-الدكتور محمد عابد الجابري- تكوين العقل العربي- ص ٥٧.

١٣- نفس المصدر- ص ٥٨.

١٤-الدكتور محد عابد الجابري- العصبية و الدولة- ص ٢٦٤.

١٥-عەتا قەرەداخی- چەمکی نەوتەت و بزوێنەری مێژوو له کۆمەڵگای کوردیدا. سلێمانی- ١٩٩٩- ل

## بەشی سێیەم

# دروست نەبوونی ناوەندی ئابوری لە کوردستانداو دەوری لە دواخستنی دروستبوونی دەوڵەتی کوردیدا

# سەرەتا

لەم لێکۆڵینەوەیەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە لە روانگەی تیۆری مارکسەوە بۆ ئابوری دەربارەی رۆڵی ئابوری وەکو بزوێنەری مێژوو بدوێین. دەشێ هەندێ تێڕوانینی مارکسیانە بۆ رۆڵی ئابوری وەکو ژێرخانی کۆمەڵایەتی و وەکو بزوێنەری مێژووش بهێنینە سنووری باسەکەوەو لەگەڵ راوبۆچوونی تر ئاخاوتنیان لەسەر بکەین بەڵام ئامانجی سەرەکی ئەم هەوڵدانە بۆ ئاخاوتن کردنە لەسەر دروست نەبوونی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا کە چۆن ئەوەش واتە ئەو کەموکورتیە لە مێژووی کۆمەڵایەتی کورددا دەوری کاریگەری گێڕاوە لە شێواندنی مێژووی کوردو گۆڕینی ئاراستەی سروشتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردیدا.

کاتێ باسی ناوەندی ئابوری و دروست نەبوونی ئەو ناوەندە دەکەین لە کوردستاندا، ئێمە ئامانجێکمان لە بەرچاو گرتووەو وای دەبینین ئەوە ئامانجی سەرەکیە لە مێژووی خەباتی کۆمەڵایەتی و رەوتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردی‌داو بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو ئامانجە قسەکردن لەسەر زۆر لایەنی کۆمەڵایەتی کوردی گرنگی‌یەکی ئەوتۆی نابێت پەیوەست بە چارەنووسی ئایندەی ئەم کۆمەڵگایە، ئەو ئامانجەش کە تاکو ئێستا وەکو ئاواتێکی سەرکوتکراو لە رووی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەوە ماوەتەوە ئەویش گەیشتنی کوردە بە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت لە رووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیەوە. راستە تاکو ئێستا لە ناوەندی رۆشنبیری

سیاسی کوردیدا هۆی نەگەیشتنی کورد دەگێڕدرێتەوە بۆ هۆکارە دەرەکیەکان، بەڵام بە تێڕوانینی ئێمە لەگەڵ دەوری لەبەرچاوی هۆکارە دەرەکیەکاندا لە هێشتنەوەی کورددا لە پەراوێزی مێژوودا هۆکاری سەرەکی پەیوەندی بە سروشت و ماهیەتی کۆمەڵایەتی کۆمکەڵگای کوردی و چۆنێتی پەرەسەندن و نەشونوماکردنیەوە هەیە.

ئێمە پێشتر لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەو دەروازانە دواوین کە کۆمەڵگکانی دنیا لێیانەوە هاتونەتە ناو مێژووەوەو دەوڵەتی خۆیانیان دروستکردووە. بەڵام کورد لە هیچ کام لەم دەروازانەوە نەیتوانیووە بگاتە ئاستی پێکهێنانی دەوڵەت. ئەمەش سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێت کە لە شێوازی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردیدا جۆرێك لە کەموکورتی هەیە کەوای کردووە ئەم کۆمەڵگایە هەنگاوی سروشتی نەنێت. بە تێڕوانینی ئێمە یەکێك لە سەرەکیترین هۆکارەکانی هێشتنەوەی کورد لە دەرەوەی پەرەسەندن و بەرەو پێشەوە چوونێکی سروشتیدا فاکتەری ئابوری‌یە کە مەبەستمان لەمەش لاوازی ئابوری و بەرهەم هێنان و کۆنەبوونەوەی ئابوری و دروست نەبوونی ناوەندی ئابورییە لە کوردستاندا.

لەم باسەدا هەوڵدەدەین لە بارەی گرنێتی ئەو ناوەندەوە بدوێین و دەوری لە بوون بە زەمینەو بنەما بۆ رسکاندنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دیاری بکەین. هەروەها لەو هۆکارە ناوخۆیی‌و دەرەکیانەش دەدوێین کە بوون بە بەربەست لە بەردەم دروستبوونی ئەو ناوەندەدا. دروست نەبوونی ئەو ناوەندەش لە لایەك بریتی‌یە لە دەرئەنجامی بارودۆخێکی ناسروشتی لە کوردستانداو لەلایەکی تریشەوە هۆی شێواندنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و دروست نەبوونی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانە بەشێوەیەکی تەواو کە ئەنجامی ئەو شێواندنەش لە گەشەی کۆمەڵایەتی کوردیدا مانەوەی کوردە وەکو کۆمەڵگایەك بەبێ دەوڵەت.

# مەبەست لە ناوەندی ئابوری چییە؟

ناوەند یان چەق مەبەست لەو خاڵەیە کە دەبێتە پنتێکی دیاریکراو و دەوروبەرەکەی پێیەوە دەبەسترێن و ئەو پنتە توانای کێشکردنی دەوروبەری بەرەو لای خۆی هەیە. دەشێ باشترین نموونە لەسەر ناوەند چەقی زەوی بێت کە بەهێزێکی دیاریکراو هەموو تەنەکان بەرەو لای خۆی رادەکێشێت. لە کۆمەڵگا خێڵایەتیەکاندا کە پەیوەندییەکانی خوێن و خزمایەتی جێگای پەیوەندییە ئابورییەکان دەگرنەوە، سروشتی ناوەندی کۆکردنەوەی ئەندامانی ئەو دامەزراوەش دەگۆڕێت لەبری ئەوەی پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان کۆیان بکاتەوە پەیوەندی خزمایەتی کۆیان دەکاتەوە. دیارە ئەوەش ئاشکرایە کە خێڵایەتی لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای خزمایەتی دروست دەبێت(١) و ئەو پەیوەندییە کە ئەندامانی (ئەم دامەزراوە) خێڵ پێکەوە دەبەستێت پەیوەندییەکی سایکۆلۆژی خوێنیە کە پەیڕەوی کات و شوێن ناکات(٢). ئەمەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئابوری و فاکتەری ئابوری لە کۆمەڵگای خێڵایەتیدا دەورێکی ئەوتۆ نابینێت لە دروستکردنی حاڵەتی کۆمەڵایەتی بووندا و هەر بەو پێیەش دەشێ نەبێتە بزوێنەری مێژوو. بۆیە ناوەندی کۆکردنەوەو راکێشانی ئەندامانی خێڵ هەمیشە بە دەوری هەرەمی خێڵ و لوتکەی هەرەمەکەدایە کە لە کۆمەڵگای کوردیشدا لەبەر بوونی ژمارەیەکی زۆ لە هەرەمی هاوشێوەو چوون یەکی خێڵایەتی و هەر بەوپێیەش دروستبوونی ژمارەیەك لە ناوەندی لاوازو نەتوانینی

پێکەوە کۆبوونەوەو یەکگرتنی ئەو ناوەندانە لە تاکە ناوەندێکی گەورەو بەهێزدا بواری دروستبوونی تاکە ناوەندێک تەسک بووەتەوە.

مەبەست لە ناوەندی ئابوری ئەو پێتەیە یان ئەو دامەزراوە ئابورییەیە کە دەبێتە چەقێك و سەرجەم ئابوری وڵات و بەرهەم و شێوازی بەرهەم هێنان دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو سەرجەم جوڵەی ئابوری لەو ناوەندەوە ئاراستە دەکرێت و هەموو لایەنەکانی ئابوری و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی ئابوری رێك دەخات و دیسپلین دەکات و خۆیشی دەبێتە ناوەندێکی کۆکەرەوەی سەرجەم داهاتی ئابوری وڵات کە ئەویش داهاتی نەتەوەییە. هەروەك ئەم ناوەندە دەبێتە سەرچاوەی کۆبوونەوەو بەکارخستن و بەرهەم هێنانی ئابوری لە وڵاتدا بە جۆرێك کە کەسێتێکی سەربەخۆی ئابوری بۆ ئەو کۆمەڵگاو وڵاتە دروست بکات و لە ئاکامدا ئابوری وەکو ژێرخانی کۆمەڵایەتی دەوری خۆی لە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و پێکهێنانی سەرخانی کۆمەڵایەتیدا دیاری بکات.

دیارە لەمێژە ئاخاوتن لەسەر ئەوە دەکرێت کە ئابوری ئەو ژێرخانە کۆمەڵایەتیەیە کە ئاستەکانی سەرخانی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات و بێ بە بنەماکردنی ئابوری ناتوانرێت ئاخاوتن لەسەر ژیانی کۆمەڵگاو سروشتی ئەو ژیانەو چۆنێتی پەیوەندییە ناوخۆییەکانی و شێوازو ئاراستەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگایە بکرێت. بە مانایەکی تر ئابوری فاکتەرێکی گرنگ و زیندووە لە بوونی کۆمەڵگاداو بەبێ بوونی ئابورییەکی یەککگرتوو بوونی ناوەندێکی ئابوری یەککگرتوو لە وڵاتدا ناشێت دامەزراوێك دروست ببێت بەناوی دامەزراوی کۆمەڵ، بە مانایەکی تر یەکێك لەو خاسێتانەی (کە هەم هۆکاریشە) کە بوونی کۆمەڵ دیاری دەکات ئابوری یەککگرتووە. ئەگەر لەم روانگەوە سەیری کۆمەڵگای کوردی بکەین لە رابردوودا ئابوری یەکگرتووی نەبووە بە تایبەتی کە ئاخاوتن لەسەر بوونی سیستەمەکانی بەرێوەبردن و سیستەمەکانی ئابوری لە رابردوودا مایەی گفتوگۆکردنەو وا پێ ناچێت

هەتا ئەم سەدانەی دوایی تەنانەت سیستەمی بەڕێوەبردن و سیستەمی ئابوری فیودیالیش لە کوردستاندا پێکهاتبێت، دیارە کە سیستەمی ئابوریش پێکنەهات ئەوا مانای وایە ئابوری یەککگرتوو، ناوەندی ئابوری بوونی نابێت، کە ئەو ناوەندە یەککگرتووەش پێک نەهاتبێت مانای وایە ئابوری بە پەرش و بڵاویی و بەش بەشی ماوەتەوە کە ئەوەش خاسێتی ئابوری کوردی بووە لە رابردوودا. واتە لە رابردوودا هەرچۆن کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی پەرش و بڵاوی خێڵایەتی بووە بەهەمان شێوە ئابورییەکی پەرش و بڵاویشی هەبووە. لە روانگەی روانین بۆ پێکهاتەی کۆمەڵایەتیەوە دامەزراوەکانی خێڵ و عەشیرەت کە رەگەزی سەرەکی بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵی کوردی بوون لاواز بوون، بەهەمان شێوە ئابوریش بەپێی ئەوان دابەشکراوەو لاواز بووەو شێوەی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی وەرنەگرتووە بەڵکو سیستەمی ئابوری و سیستەمی خێڵایەتی کە هەردوکیان سیستەمێکی لاواز و سنووردارن لە کۆمەڵگای کوردیدا لەوساوە بۆ ئێستا باڵادەستن کە ئەوەش پێچەوانەی دروستبوونی تاکە ناوەندێکی ئابوری و بەو شێوەش دژی دروستبوونی تاکە ناوەندێکی بەڕێوەبردنە، هەر لەسەر ئەم بنەمایەو لەم تێڕوانینەوە ئەگەر بەپێوانەی کۆمەڵایەتی بڕنی کۆمەڵگا سەیری کورد بکەین ئەوا لەم رووەوە خاسێتەکانی کۆمەڵگای تەواوی نیە بەڵکو پێکهاتەیەکی پەرش و بڵاوە لە دامەزراو و هەرەمی هاوشێوەی یەکتری کە فاکتەری ئابوری لە بەر لاوازییەکەی و لەبەر نەتوانینی بەبوونی تاکە سیستەمێکی ئابوری و تاکە ناوەندێکی ئابوری نەیتوانیووە ئەو دامەزراوە چوون یەك و هەرەمە هاوشێوانەی خێڵ و عەشیرەتەکان هەڵبوەشێنێتەوەو لە یەکەیەکی بەرفراوانتری یەککگرتوودا کۆمەڵگا رێك بخات و لەو پرۆسەیەشدا سیستەمی یەککگرتووی ئابوریو سیستەمی یەککگرتووی بەڕێوەبردن پێك بێت.

ئێستا ئەوە ئاشکرایە کە ناوەندی ئابوری لە کوردستانداو سیستەمی ئابوری خاوەن سیماو خەسڵەت و بنەمای تەواوەتی پێک نەهاتووەو ئەوەش دەوروکاریگەری خۆیی لەسەر ژیان و بنەمای تەواوەتی پێک نەهاتووەو ئەوەش دەورو کاریگەری خۆیی لەسەر ژیان و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایە بینیبوو و هۆی سەرەکی ئەم بارە ناسروشتییە کە بە درێژایی مێژوو کۆنترۆڵی کۆمەڵگای کوردی کردووە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان هۆکار. واتە هۆکاری دروستنەبوونی ناوەندی ئابوری. بۆ ئەوەی ئاخاوتن لەسەر هۆیەکانی دروستنەبوونی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا بکەین پێویستە سەرچاوەکانی ئابوری کوردستان و خاسیێتەکانی ئەو ئابورییەو سیستەمی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی بەرهەم هێنانیش لەم کۆمەڵگایەدا ئاخاوتنیان لە بارەوە بکرێت.

# سەرچاوەکانی ئابوری کوردستان لە رابردوودا

لە دێرزەمانەوە دوو سەرچاوەی دیاری ئابوری لە کوردستاندا هەبوون. یەکەمیان سەرچاوەی ئاژەڵداری و شوانکاری، دووەمیان سەرچاوەی کشتوکاڵ، دانیشتوانی کوردستان پشتیان بەم دوو سەرچاوەیە بەستووە لە دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی ژیانیاندا. دیارە هەریەکە لەم دوو سەرچاوەش سیماو خاسێت و سروشتی تایبەتی خۆیان هەیەو راستەوخۆ بەندن بە سروشتی جۆگرافی و تۆپۆگرافیای کوردستانەوە. بۆیە بەبێ ئاخاوتن و قسەکردن لەسەر دەوری تۆپۆگرافیاو جوگرافیای کوردستان ناتوانرێت رووی سروشتی ئابوری کوردی و پەیوەندی و دەوری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا دەربخرێت. خۆ ئەگەر ئەو سەرچاوە ئابورییەش ناوەندێك دروست نەکات و نەبێتە بنەمایەکی بەهێز بۆ کۆمەڵگاو سەرخانی کۆمەڵگاش بە سروشتی دروست نەکات ئەوا دیسان کۆمەڵگا دەخاتە بەردەم گومانێکی خنکێنەرەوە لەوەی ئایا ئەو پێکهاتە بووە بە کۆمەڵگا یان لە خوار ئاستی بە کۆمەڵگا بوونەوەیە. بێگومان نەتەوەش وەکو نەتەوە هەتا سەرجەم بنەماکانی کۆمەڵگا ئامادەبوونیان نەبێت ناشێت نەویش بوونی هەبێت. لەم بارەیەوە دوکتۆر سەمیر ئەمین دەڵێت: نەتەوە لە راستیدا کاتێك دەردەکەوێت ئەگەر چینێکی کۆمەڵایەتی کە دامودەزگای دەوڵەتی ناوەندی بەدەستەوەیەو دەیجوڵێنێ، یەکێتی ئابوری ژیانی کۆمەڵ دابین بکات(٢). ئێمە دەزانین لە درێژەی مێژووی کوردا نە ئەو چینە کۆمەڵایەتی‌یە بەهێزە دەرکەوتووە، نە دەوڵەتیش لە مێژووی کورددا بەو خاسێتانەوە دروستبووە. واتە لێرەدا رووبەڕووی دوو بۆچوون

دەبێنەوە. یەکەمیان ئەگەر بوونی چینێکی خاوەن ئاسنامەو بەهێز لە رووی دەسەڵاتەوە بتوانێت ئەو یەکێتی‌یە ئابورییە دروست بکات کە توانیبێتی دەوڵەت دروست بکات ئەوا لە کوردستاندا ئەو چینە کۆمەڵایەتیە دروست نەبووە. دووەمیش ئەگەر ئەو ئابوریە وەکو ناوەندێك زەمینەی پێکهانی ئەو چینە کۆمەڵایەتیە پێکبهێنێت ئەوا ئەو ناوەندە ئابورییەش لە کوردستاندا دروستنەبووە؛ هەر لێرەوە دەردەکەوێت کە هاوکێشەکە لەهەر جەمسەرێکیانەوە دەست پێ بکات ئەوا لە مێژووی کۆمەڵگەی کوردیدا زەمینەی ئەو دەست پێکردنەوە پێکنەهاتووە. ئەوەش لە پلەی یەکەمدا دەگەرێتەوە بۆ سروشتی سەرچاوەی ئابوری کوردستان کە لە ئاستێکدا بوە بە درێژایی مێژوو نەیتوانیووە ببێتە بنەمایەکی پتەو و بەهێزو زنجیرخانێکی توندو مکوم بۆ فۆرمەلەکردنی سەرخانی کۆمەڵایەتی کوردی، سەرخانێکی ئەوتۆ کە بتوانێت بکرێت بە بنەمای توێژینەوەو لێکۆڵینەوە بۆ سەلماندنی گەشەو پەرەسەندنی (سروشتی) کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی.

سەرچاوەی ئابوری کوردستان کە ئابوری ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بووە هەر لە دێرزەمانەوە نەیتوانیووە بەشێوەیەکی بەربڵاو پەرە بسەنێت، بەڵکو تەنیا لە سنووری (بەشی خۆکردندا- الاكتفاء الذاتي) دا ماوەتەوەو کۆمەڵی کوردی ئەوەندە خەریکی پەروەردەکردنی ئاژەڵ بووە کە بەشی پێداویستی‌یەکانی ژیانی خۆی بکات. هەروەها ئەو بەشەی کورد لە خێڵ و عەشیرەتەکان کە نیشتەجێ بوون ئەوەندەیان کشتوکاڵ کردووە کە بەشی خۆیان بکات. هۆی ئەوەش ئاشکرایەو دەگەرێتەوە بۆ تۆپۆگرافیای ناڵەبارو ئاوهەوای ناڵەباری کوردستان کە هیچیان رێگای بەخێوکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵیان خۆش نەکردووە بە جۆرێك کە ئەم دوو سەرچاوەیە بەرهەمێکی ئەوتۆیان لێوە بەدەست بێت کە لە دانیشتوانی کوردستان خۆیان زیاد بێت و لە ئاکامدا ئەو بەرهەمە کۆببێتەوەو ناوەندێکی ئابوری و لە ئاکامیشدا بازاری هاوبەش پێکبهێنێت و سیستەمی دیاری کراوی ئابوری و بەو پێیەش سیستەمی دیارو خاوەن ئاسنامەی کۆمەڵایەتی و بەرێوەبردنی لێوە بکەوێتەوە.

## بەشی خۆکردن (الاكتفاو الذاتي) و سروشتی بەرهەم هێنان لە کوردستاندا

ئێمە پێشتر ئامارەمان بۆ ئەوە کرد کە بەبێ بوونی بنیادێکی ئابوری بەهێز ناشێت کۆمەڵگا قۆناغەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بە سروشتی ببڕێت و خاسێتە دیارەکانی هەریەکە لەو قۆناغانەش لەکاتی خۆیاندا بەدەست بهێنێت و لەسەر قۆناغەشدا سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابوری سەر بەو قۆناغە دروست بکات. بۆ نموونە لە قۆناغی کۆیلایەتیدا سەرجەم خاسێت و بنەماکانی ئەو قۆناغە وەربگرێت و سیستەمی کۆیلایەتی پێکبهێنێت، هەروەها بە گوێرەی قۆناغەکانی تری پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیش.

بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەوە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی دواکەوتن و مانەوە لە جوغزێکی داخراو و پێشنەکەوتن و پەرەنەسەندنی ئابوری لەسەر وڵاتێکدا ستراتیژی بەرهەم هێنانە لە ئاستی تەنیا بەشی خۆکردندا. بەتایبەتیش ئەگەر لەو وڵاتەدا بواری بەرهەم هێنانی زیاترو برەوپێدان و پەرەسەندنی ئابوری هەبێت. مرۆڤ بە سروشتی وا دروستبووە کە خواستێکی زیاد لە پێویستبوونی خۆیی بۆ بەدەست هێنانی درامەت هەیەو هەمیشە دەیەوێت گەورەترین سامان کۆبکاتەوە چونکە ئەوە گومانی تێدا نیە کە چ وەك تاك و چ وەك کۆ بنیادی ئابوری یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکان بۆ سەلماندنی بوون،

بەبێ بنەمایەکی ئابوری دەوڵەمەند ناشێت نە تاك و نە کۆمەڵ بتوانن بوونی خۆیان بسەلمێنن و ئامادەبوونی خۆیان بنوێنن.
بەشی خۆکردن لە کوردستاندا هەر لە دێرزەمانەوە پەیوەندی هەبووە بە کۆمەڵە هۆکارێکەوە کەوایان لە مرۆڤی کورد کردووە جۆرە قەناعەتێکی لا دروست ببێت کە تەنیا بیر لەوە بکاتەوە ئەوەندەی داهات هەبێت لەسەری بژی نیتر بەسیەتی. کەواتە با بپرسین ئەو هۆکارانە چین کە وایان لە کورد کردووە ئەو جۆرە قەناعەتەی لا دروست ببێت؟
هۆکاری یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی خێلایەتی کۆمەڵگای کوردی کە هەر خێڵە لە سنوورێکی تەسك و داخراوی جوگرافیدا یان نیشتەجێ بووە یان لە قەڵەمڕەوێکی دیاری کراودا گەرمیان و کوێستانی کردووەو ئەم شێوازەی ژیانیش واتە ژیانی خێلایەتی ڕێگای بۆ ئەوە خۆش نەکردووە بەرهەم هێنان پەرەبسەنێت چونکە ژیانی کۆچ و گەرمیان و کوێستان ژیانێکی سەخت بووەو هەر خێزانە توانای ئەوەی هەبووە ژمارەیەکی سنووردار مەڕومالات بەخێو بکات کە بەشی خۆی بکات. هەروەها لە ژیانی خێلایەتی نیشتەجێنشدا دیسان سیستەمی کۆمەلایەتی ڕێگا خۆشکەر نەبووە بۆ بەرهەم هێنانی زۆر، کاتێکیش کە کۆمەڵگایەك یان دەستەیەك کۆمەلایەتی نەتوانێت بەرهەمی ئابوری پێویست بەرهەم بهێنێت ئەوا ناشتوانێت دەمەزراوە کۆمەلایەتیەکانی خۆی دروست بکات و سیستەمی کۆمەلایەتی خۆی بنیاد بنێت چونکە بەبێ بەرهەم هێنانی پێداویستیەکانی ژیان وەکو پێویست کۆمەڵ ناتوانێت بیناو ئاوەدانی بکاتە ئەرکی خۆی. هەتا ئەوەدانکردنەوەش نەبێتە بنەمای کارەکانی کۆمەڵ مانای وایە ئەو کۆمەڵگایە نەگەیشتۆتە ئاستی کۆمەلایەتی بوون. یەکێك لە گرفتەکانی بەردەم پەرەسەندنی کۆمەلایەتی کورد لە ڕاستیدا نەبوونی توانای بەرهەم هێنانی پێویست بووە لە ڕابردوودا کە ئەوەش بەشێکی سەرەکی پەیوەندی بە باری کۆمەلایەتی کوردیەوە هەبووە کە لەلایەك سیستەمێکی کۆمەلایەتی دیار

پێکنەهاتووەو بنیـادی خێڵایـەتی کۆمـەڵگاش بـە ئەندازەیـەك رەگ و ریشەی هەبووە لەنێو ئەم کۆمەڵگایەدا کە زیاتر لەوەی لە کۆمەڵگا بچێت بریتی بووە لە کۆمەڵە خێڵ و عەشیرەتێکی ناپەیوەست و دوور لـە یەکتر لەو حاڵەتەشدا بەرهەم هێنان لە سنووری ئەو یەکەو دامەزراوە. بچووك و سنوور تەسـکانەدا ماوەتـەوەو ئـابوری نـەیتوانیووە کۆنترۆڵی جوڵـەی هەموو کۆمەڵگا بکات و جۆرێك لـە هاریکـاری و یـەکگرتن و یـەکبوون لـە نێوانیـاندا دروسـت بکـات کـە ئـەوەش زیـاتر دەگەڕێتـەوە بـۆ هۆکـاری نیشتەجێ نەبوون و نـەتوانینی بەرهـەم هێنـانی لـە رادەی پێویسـتی خۆ زیـاتر کـە ئـەو بەرهەمـە بنـەماکانی دروسـتبوونی بـازاڕی هاوبـەش برسکێنێ و زەمینەی کۆمەڵایەتی بوونی تەواوەتی خێڵ و عەشیرەتەکان خۆش بکات و لەوێشەوە هاریکاری و بنیادنان دەست پێ بکات کە ئەو هاریکارییەش کە دەرئـەنجامی کۆمەڵایـەتی بوونـە رۆحـی کۆمەڵایـەتی بگەیەنێتـە پلـەی رەهـای و لـە وێـڕا بـە چـەمکی هیگڵـی قۆنـاغی دروستبوونی دەوڵەت دەست پێ بکات.. کۆمەڵایـەتی بوونـی مـرۆڤ بـە پێویست روویداوەو زانایان ئەوەیان دەربڕیووە کە مرۆڤ بە سروشـتی ئەفریدەیـەکی کۆمەڵایەتیـەو دەبـێ کۆمەڵایـەتی بێـت کـە کۆمەڵایـەتی بوونیش (لە شوێندا دەبێت) و ئەوان ناوی دەبەن بە شار ئەویش مانـای ئاوەدانکردنەوەو(٤) و نیشتەجێ بوون هەڵدەگرێت.

راسـتە پێداویسـتی‌یەکانی ژیـان مـرۆڤ ناچـاری پێکـەوە ژیـان و کۆمەڵایەتی بوون دەکات بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە ئەگەر لـە سنووری کۆمەڵگایەکدا هاریکاری و پێکەوەژیان ببێتـە بنـەمای پێکـهێنانی یـەك سیستـەمی ئابوری و بەڕێوەبردن و یـەك ناوەندی ئـابوری پێکبێـت ئـەوا ناوەندی جوڵە رێکخەری کۆمەڵگاش دەبێتە یەك ناوەندو ئەو ناوەندەش بێگومان خۆی لە زەمینەیەکدا دەبینێتەوە کە ئەویش زەمینەی ئابورییە، واتـە ناشـێت بـەبێ بوونـی نـاوەندێکی ئـابوری نـە کۆمـەڵگا خاسـێتی یـەکگرتنی هـەبێت، نـە ئاراسـتەی گەشـەو پەرەسـەندنی کۆمەڵایـەتی بـە

ئاقارێکی دروست و سروشتیدا بڕوات و بتوانێت قۆناغەکانی خۆی بە ڕێکی و بەتەواوی ببڕێت و بگاتە ئە و ئاستەی کە لە دامەزراوەکانی خێڵ و عەشیەرت کە دامەزراوی پەرش و بڵاون دامەزراوی یەکگرتووی نەتەوە یان کۆمەڵ دروست بکات، یەکێك لە کۆسپەکانی بەردەم کورد بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی بەدەست هێنانی خاسیێتەکانی نەتەوەو کۆمەڵگا ئەوەیە کە تاکو ئێستا ناوەندێکی ئابوری نەتەوەیی یان ناوەندێکی ئابوری یەکگرتوو بۆ هەموو کۆمەڵ دروست نەبووە هەتا دیوارەکانی نێوان خێڵ و عەشیرەت و سەرجەم دامەزراوەکانی قۆناغی خێڵایەتی هەڵبوەشێنێتەوەو دامەزراوی یەکگرتوی باڵا لەسەر ئاستی نەتەوە دروست بکات، دیارە ئەم حاڵەتەش لە مێژووی کورددا لەلایەك پەیوەندی بە عەقڵیەتی بەرهەم هێنانی تەنیا بەشی خۆوە هەیە کە ئەو عەقڵیەتەش لە بنەڕەتدا بەرهەمی پێکهاتەی خێڵایەتی کوردی‌یە کە تەنانەت خودی ئەو پێکهاتە خێڵایەتیەش پێکهاتەیەکی ناسروشتی و نائاسایی‌یەو تاکو ساتەوەختی ئێستاش هیچ بنەمایەکی یەکبون و یەکگرتنەوەی لەگەڵ یەکتردا نیە کە ئەمەش دیسان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە تێکڕای هێزی بزوێنەرو ڕۆح و ماهیەتی بوونی خێڵایەتی کوردی بریتی‌یە لە بنەماکانی خوێن و خزمایەتی و فاکتەری ئابوری هیچ دەورێکی ئەوتۆی نیە لە داڕشتن و بەرهەم هێنانی عەقڵ و ستراتیژی خێڵایەتی کوردی‌دا. چونکە هۆکارەکانی خوێن و خزمایەتی بە ئاسانی ڕێگا نادەن بۆ سازش و سەوداگەری لەگەڵ ئەوانی تردا لە ڕوانگەی بە پیرۆز سەیرکردنی خۆیانەوە، بەڵام فاکتەری ئابوری هیچ شتێك بە پیرۆز نازانێت تەنیا (ماڵ-درامەت) نەبێت، لە پێناوی ئەوەشدا هەموو سنوورە پیرۆزەکان دەڕوخێنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی خێڵایەتی کوردی لە ژێر کۆمەڵە هۆکارێکی تردا قەناعەتی بەرهەم هێنانی تەنیا بەشی خۆی لا دروست بووە، ئیتر بەو پێ‌یەش فاکتەری ئابوری لە کۆمەڵگای کوردی‌دا نەیتوانیووە ئەو دەورە ببینێت.

هۆكارێكی تری رادەی كەمی بەرهەم هێنان لە كوردستانداو بەو پێیەش كۆنەبوونەوەی بەرهەم و دروستنەبووی ناوەندی ئابوری دەگەرێتەوە بۆ تۆپۆگرافیای نالەباری كوردستان. تۆپۆگرافیای كوردستان بەگشتی لە شاخ و گردو یاڵ و دۆڵ و شیو و دەشتی تەسك پێكهاتووە كە بەشێكی زۆری لە بەردو تاوێرو جێگای نالەباری ئەوتۆ پێكهاتووە كە نەك هەر ناتوانرێت بكرێت بە كشتوكاڵ بەڵكو ئەوەندە وشك و رەقەنە هیچی لێ سەوز نابێت و ئەو شوێنانە نە بۆ كشتوكاڵ دەست دەدەن نە دەشبن بە پاكژو لەوەرگا. لە لایەكی ترەوە تۆپۆگرافیای كوردستان لە چیای بەرزو قەدپاڵی لێژی ئەوتۆ پێكهاتووە كە بۆ هیچ جۆرە بەرهەم هێنانێك كەڵكی لێوەرناگیرێت، ئەو دەشتە تەسك و كەمانەشی كە لە دامێنی چیاو گردەكانەوە هەن زۆربەیان دێمن و ئاودێری ناكرێن، مەگەر تەنیا بۆ كشتوكاڵی دێمەكار بەكابهێنرێت. لەم بارودۆخە تۆپۆگرافیەی كوردستاندا بەرهەم هێنان كارێكی گران و زەحمەتەو مرۆڤ لەم زەمینە نالەبارەدا هەموو ئومێدێكی ئەوە بووە چ لە پەروەردەكردنی ئاژەڵداو چ لە كشتوكاڵ كرندا ئەوەندەی بەرهەم دەست بكەوێت كە بتوانێت ژیانی خۆیی پێ مسۆگەر بكات و بە ئەوەندە وازبهێنێت كە بەشی ژیانی ساڵانەی خۆی بكات، ئەوەش وایكردووە كە بەرهەم لە ئاستی پێویست و بەكارهێنان زیاد نەبێت و بەوەش نە بەرهەم كۆببێتەوەو نە ناوەندی ئابوری دروست ببێت نە هەلومەرج بۆ پێكهاتنی بازاڕی هاوبەش لە وڵاتدا برەخسێت.

لە لایەكی ترەوە نەبوونی زەوی لەبار بۆ كشتوكاڵ و ئاوی پێویست بۆ ئاودێری هۆیەكی تری كەم بەرهەم هێنان بووە لە كوردساتاندا. شەرەف خان لە بارەی خاكی كوردستانەوە دەڵێت: خاكی كوردستان بە لوڕستانیشەوە بەشی زۆری رەقەنەو چڕو لێڕەوارەو نەرمانی ئەوەندە نیە كە بەرهەم و درامەتی كشتوكاڵی دانیشتوانی هەموو بە تەسەلی تێر بكات(٥). ئەمەش وایكردووە كە كوردستان وڵاتێكی كشتوكاڵی نەبێت و

بەرهەمی کشتوکاڵ نەك هەر لە پێویستی دانیشتوان زیاتر نەبێت بەڵکو نەگاتە ئەو ئاستەش کە بە تەواوی تێریان بکات. ئیتر چۆن ئابوری لە کوردستاندا ببێتە زەمینەی تێکشکاندنی سنوری نێوان دام و دەزگاکانی خێڵ و عەشیرەت و بنەمای کۆمەڵایەتی بوون و بەو پێیەش بنەمای نەتەوایەتی کورد دابنێت. بێگومان لەسەر زەوییەکی وا هەژارو کەم بەرهەم ناشێت ناوەندی ئابوری و بازاڕی هاوبەش دروست ببێت. لە بارەی ئابوری باشوری کوردستانەوە کە بە ڕای شەرەف خان: ئەو بەشەی کوردستان لە هەموو شوێنەکانی تری کوردستان بە پیت و ڕێژەوترە(٦) ئەدمۆنز دەڵێت: ئابوری ئەم هەرێمە بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە کشتوکاڵ و شوانکاری دەبەستێت و بەرهەمی سەرەکی زستانە گەنم و جۆیە کە ئەویش لەوانەیە لە ساڵانی پڕ پیت و فەڕدا بەشێکی کەمی کە زیاد دەبێت بنێردرێتە دەرە وە(٧). لێرەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە تۆپۆگرافیای کوردستان و کەش و هەواکەی لەبار نین بۆ کشتوکاڵ و نەیانتوانیووە ببن بەهۆی کۆکردنەوەی بەرهەمی زیاد لە پێویست لە کوردستاندا بەڵکو لە باشترین حاڵەتدا ئەوە بووە بەشی پێداویستی ناوخۆ بەرهەم هەبووبێت دیارە کورد خۆیشی بە خۆڕسکی و لە ئەنجامی کۆمەڵە هۆکارێکدا جۆرێك لە قەناعەتی لا دروستبووە کە بە دوای بەرهەم هێنان و داهاتدا نەڕوات و تەنیا بەدەستکەوتێکی کەم بۆ ژیانێکی سادە قەناعەت بکات. لەم بارەیەوە شەرەف خان دەڵێت: کوردەکان هەموویان زۆر چاوتێرو کەم چاو نەزێرن و هەرگیز کازەندە لە بەختی خۆیان ناکەن. زۆربەی زۆری خێزان و ماڵ و منداڵی ڕەمەکی و بۆرە پیاوی کوردستان بەشی زۆری ساڵ بە نانی هەرزن و گارس و گاڵ ڕای دەبوێرن و لەسەر ئەو بەلەنگازییەشەوە شوکرانە بژێرن(٨) یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانەی کە بە درێژایی مێژوو زیانی لە کورد داوەو بووە بە بەربەست لە ڕێگای جوڵەو بەرەوپێشەوەچووندا هۆکاری قایل بوونی کوردە هەمیشەو هەموو کاتێ بە ئەمریواقیع، قەناعەت هێنان بەوەی کە

به برسێتی و هەژاری و نەداری بژێت ڕێگا خۆشکەر بووە بۆ ئەوەی هیچ هەوڵێك نـەدات بـۆ زیـادکردنی بەرهـەم و خۆشـگوزەران کردنـی خـۆی، ئەگەر کۆمەڵگایەك یان دەستەو تاقمێکی ئیتنیکی هەوڵی گۆڕین و بەرەو چاکترکردنی باری ژیانی خۆی لە هەموو لایەکەوە نەدات چۆن دەتوانێت ببێتە هێزێکی فشار دروستکەرو هـەوڵی گۆڕینـی کۆمـەڵگا بـدات. ئـەم هۆکارانەی جوگرافیای نالەباری کوردستان و ئاووهەواو ئاو بۆ ئاودێری سەرجەم لەبەر نالەبارییان ڕێگا خۆشکەربوون بۆ دروستکردنی قەناعەت لە عەقل و هۆشی کورددا بەوەی کە تەنیا بە بەشی ژیانی خۆی بەرهەم و داهات رازی بێت.

لـە لایـەکی تـرەوەو سـەرباری ڕۆڵـی خراپـی تۆپۆگرافیـا لـە بـەردەم دروستبوونی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا، هۆکارێکی سەرەکی تر بۆ لاوازی ئـابوری کـەمی ئـاوی پێویسـت و گرانـی بـاری ئـاودێری‌و پشـت بەستنە بە ئاوی باران. کشتوکاڵی دێم واتـە دانەوێڵە تـەنیا پشـتی بـە باران بەستووەو ئەگەر هەر ساڵێك باران وەکو پێویست نەباری بێت ئـەوا بووە بە قات و قڕی و کارەساتی برسێتی و گرانـی ولاتـی گرتۆتـەوە. لە لایەکی تریشەوە پشت ببەستن بە باران مرۆڤی کوردی کردۆتە مرۆڤێکی هەمیشە چاوەڕوان، دیـارە مرۆڤـی هەمیشـە چـاوەڕوانیش بـەردەوام لـە حاڵـەتی گومـان و دڵەڕاوکێدایـە بەرامبـەر بـە داهـاتوویی و کـەمتر دەبێتـە مرۆڤێکی پراکتیکی. لە ئاکامی ئەوەشدا کە سەرچاوەی سەرەکی ژیـانی کە ئاوە لـە دەسـتی خۆیـدا نـەبووەو چاوەڕوانی هـێزی بـالاّی خـواوەنـدی کردووە کە بارانی بۆ ببارێنێ و بەردەوام چاوەڕوانی سۆزو بەزەیی خودا بـووەو کـەمتر بـیری لـە دانـانی نەخشـەو بەرنامـەی داهـاتووی خـۆی کردۆتەوە. ئەگەر کەسێك یان کۆمەڵگایەك نەتوانێت بەرنامـەو نەخشـەی داهـاتووی هـەبێت بێگومـان ناشـتوانێت بـیر لـە بەرهـەم هێنـانی زیـاد بکاتـەوە بـەڵکو ئـەوەی بەلایـەوە گرنـگ دەبێـت کـە چـۆن دەتوانێـت پێداویسـتی‌یەکانی ژیـانی ئێسـتای بەدەسـت بـهێنێت و سـبەینێ لـە

دەرەوەی بیرکردنەوەی ئەودا دەبێت. کاتێ مرۆڤی کورد بیری لە بەرهەم هێنانی زیاد نەکردبێتەوە ئیتر چۆن ئابوری لە کوردستاندا کۆدەبێتەوەو چۆن ناوەندی ئابوری پێکدێت.

لەلایەکی ترەوە فاکتەری ئایین و تواندنەوەی کورد لەناو بنەماو پرنسیپەکانی ئاییندا دەورێکی کاریگەری بینیووە لە دروستکردنی قەناعەت و قەناعەت هێنان بە کەمترین بەش کە پێویستی‌یەتی واتە (بەشی خود) کردن لە عەقڵ و هۆشی مرۆڤدا بەگشتی و لای کوردیش بە تایبەتی کاریگەری هێزی ئایین لە پشتی‌یەوە بووە. چونکە کورد وا لە ئایین تێگەیشتووە کە رازی بێت بە هەموو بەشێك و بە کەمترین بەش ئیکتیفا بکات ئەویش لەبەر بنەمای بڕوابون بەوە کە (رزق لای خوایەو خوا تاسەری دابێت رزقیش دەدات و تۆ هەر بجوڵێ خوا رازیقە) ئەم رستەو دەستەواژانە کە بەرهەمی عەقڵی کۆیی کۆمەڵگان هەڵقوڵاوی واقیعێکی کۆمەڵایەتی ئایینین و گوزارشتێکی راستەقینەن لە پانتایی کۆنەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی.

هۆکارێکی تر کە دەوری هەبووە لە دروستکردنی حاڵەتی قەناعەت هێنان بە بەرهەم هێنانی تەنیا بەشی خۆ (ئیکتیفای زاتی) سیستەمی فیودیالی و خێڵایەتی کوردی و چۆنێتی بەرهەم هێنانە لەم سیستەمەدا. دیارە ئەوە ئاشکرایە کە سیستەمی فیودیالی کوردیش لە ئۆناغێکی زۆر درەنگدا خاسێتەکانی سیستەمی وەرگرتووەو بگرە سیستەمی فیودیالی کوردی بە تەواوی تێکەڵ بووە لەگەڵ سیستەمی خێڵایەتی کوردی‌داو هەر ئەوەش وایکردووە کە یاساکانی خێڵایەتی لە سروشتی ئەو سیستەمەدا کاری خۆی بکات لەم بارەیەوە ئەی. شامیلۆف دەڵێت: لە راستیدا لە کۆمەڵگای (فیودیالی) کوردیدا زۆرێك لە پاشماوەکانی سیستەمی خێڵایەتی دەبینرێت(٩) دیارە یاساکانی سیستەمی خێڵایەتی لەگەڵ سیستەمی فیودیالیدا هەمان یاسا نین، هەر بۆیە سیستەمی فیودیالی کوردی بە سیستەمێکی ناتەواو دادەنرێت چونکی

ئاشکرایە کە دەبێ سیستەمی فیودیالی هەموو بنەماکانی سیستەمی خێڵایەتی و عەشیرەتگەری هەڵوەشێنێتەوەو بیان گۆڕێ بە جۆرە یاساو دەستورێکی تر چونکە یاساو دەستورەکانی سیستەمی خێڵایەتی لە داب و نەریتی خێڵایەتیەوە هاتوون کە لە راستیدا سیستەمی فیودیالی کوردی نەیتوانیووە ئەو داب و نەرتیە کۆمەڵایەتیانەی کۆمەڵگای خێڵایەتی بگۆڕێت و بگرە تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە. لە راستیدا دەبێ: فیودیالیزم یارمەتی هەڵوەشاندنەوەی یاساو دەستورەکانی ئابوری خێڵایەتی بدات بەڵام لەلایەکی ترەوەو بەشێوەیەکی تا رادەیەك ئاشکرا پارێزگای لە بەهاکانی خێڵایەتی دەکات(١٠) ئەمەش ئاشکرایە چونکە خێلایەتی و فیودیالی کوردی بەنێو یەکدا چوون و سیستەمێکی پێکەوەیی پێکدێنن کە ئەویش نە سیستەمی خێڵایەتی‌یە بەتەنیاو نە سیستەمی فیودیالی‌یە. لە سیستەمی فیودیالیدا یاساکانی زەوی زارو کشتوکاڵ و ئاودێری هەمان یاساکانی قۆناغی فیودیالی خێڵایەتی بووەو ئاغاو بەگ و شێخی سەرۆك خێڵ و عەشیرەت خۆی داهێنەری یاساو دەستورو شێوازی رێکسختنی پەیوەندییەکانی نێوان خۆی و ئەندامانی خێڵ بووەو لە سنووری داخراوی دامەزراوەکەیدا سەربەخۆیی یاساو دەستورەکانی پاراستووەو زۆربەی کات یاساو دەستورەکانی سنووری ئەم خێڵ لەگەڵ یاساو دەستوورەکانی ئەو خێڵی تردا لە رووی شێوەی کارکردن و مڵکانەو سەرانەو سورانەو بێگارکردنەوە یەکیان نەگرتۆتەوە بە پێچەوانەی سیستەمی فیودیالی‌یەوە کە دەبێ یاساو دەستورێکی گشتگر پەیوەندییەکانی بەردەم هێنان و بەرێوەبردن و هەموو وردەکارییەکانی ژیانی کۆمەڵگا رێك بخات. بەڵام ئەم تێکەڵاوییە وایکردووە کە سیستەمی بەرێوەبردن و پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنانی خێڵایەتی کوردی بەسەر قۆناغی فیودیالیدا زاڵ بێت، دیارە ئەوەش ئاشکرایە کە سیستەمی خێڵایەتی هەمیشە بەربەست بووە لە رووی بەرهەم هێنانی زیاددا چونکە جوتیاری قۆناغی خێڵایەتی هەموو

شتێکی پەیوەست بووە بە سەرخێڵ و یاسای خێڵەوەو خۆی تەنیا مافی ئەوەی هەبووە ئەوەندەی هەبێت بژی، لە کاتێکدا کە جوتیار بەهەر جۆرێك ئیشی کردبێت ئەو تەنیا لایەنی هەرە کەکی مافی ژیانی هەبووە، لەبەرئەوە گرنگ نەبووە بەلایە وە چەندێ بەرهەمی دەبێت چونکە ئەو خاوەنی بەرهەم نەبوە ئەمەش وایکردووە لە سیستەمی خێڵایەتی-فیودیالی کوردیدا بەرهەمێکی ئەوتۆ لە کوردستاندا کۆنەبێتەوەو هەر بەو پێیەش نە ناوەندی ئابوری دروست ببێت نە بنەماکانی بازاڕی هاوبەش پێك بێت.

وەك ئاماژەمان بۆ کرد خودی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کورد کە لە خێڵ و عەشیرەت پێکهاتووە دەوری کاریگەری هەبووە لەسەر ڕێژەی کەمی بەرهەم هێنان، لە دێرزەمانەوە تاکو ناوەڕاستی سەدەی بیستیش هێشتا بەشێکی زۆری خێڵەکانی کورد نیشتەجێ نەبوون و خۆیان بە کشتوکاڵەوە خەریك نەکردووە و زیاتر پشتیان بە شوانکاری و ئاژەڵداری بەستووەو لەو بوارەشدا خەریکی گەرمیان و کوێستان بوون واتە لە ژیانی کۆچەریدا بوون، کۆچەریش ئاسایی نەدەتوانێت ئاوەدان کردنەوە بکات نە بەرهەمێکی ئەوتۆ بهێنێت نە پەیوەستی بە خاکەوە هەبێت، خێڵی کۆچەری ئەوەندە بەرهەمی هێناوە کە بەشی پێویستییەکانی ژیانی سادەو ساکاری خۆی بکات، خۆ ئەگەر خێڵی کۆچەری کوردی بەرهەمێکی لەخۆی زیاتریشی هەبووبێت لە بەرهەمەکانی ئاژەڵ ئەوە لەکاتی گەرمیان و کوێستاندا زۆرجار کە نزیك بووەتەوە لە سنوورەکانی کوردستان بەرهەمەکەی لەلایەن دەرەوە ڕاکێشراوەو ئەو بەرهەمە لە کوردستاندا کۆنەبۆتەوە هەتا ببێت بە بنەمای پێکهێنانی بازاڕی ناوخۆو کاکڵەی دروستبوونی ناوەندی ئابوری کوردی. دەشێ هەندێ جار خێڵی کۆچەری کوردی بەرهەمەکانی خۆی کە بەرهەمی مەڕومالآت بووە لەسەر سنوورەکان لەگەڵ پێداویستییەکانی تری ژیانیدا کە زیاتر پێداویستییەکانی خۆراك و

جل و بەرگی سادە بوون ئاڵ و گۆڕی کردبن و ئەو بەرهەمە لەناو وڵاتدا نەماوەتەوەو هەتا ببێتە بنەمای پێکهێنانی بازاڕو سەرەتاکانی پیشەسازی لە کوردستاندا.

هۆکارێکی تری کەمی بەرهەم هێنان لە کوردستاندا پەیوەندی بە سروشتی پەیوەندییەکانی فیودیالی ناتەواو و ناسروشتی کوردییەوە هەیە، کە مەبەست لەوەش ئەوەیە نە فیویدیالی کورد وەکو چینێکی خاوەن ناسنامەو خاوەنی سەرجەم خاسێت و بنەماکانی چینایەتی ئە و چینە پێگەیشتووە، نە لە بەرامبەر ئەو چینەدا جوتیاران وەکو چینێکی خاوەن ناسنامەو سەرجەم بنەماو خاسیەتەکانی خۆیان لە حاڵەتی سروشتیدا پێگەیشتوون، هەر بۆیە پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان و پەیوەندییەکانی مڵکداری و خاوەندارێتی زەوی و کاری جوتیار لەسەر زەوی ئەوان بە سروشتی دروست نەبووەو شێوازی سیستەمێکی جێگیرو خاوەن ناسنامەی وەرنەگرتووەو زۆربەی کات خاوەن مڵکی کورد زەوییەکەی بەرامبەر بە ڕێژەیەکی دیاریکراو لە مڵکانە داوە بە جوتیار بۆ ئەوە ی کشتوکاڵی تێدا بکات، لەلایەك خودی خاوەن زەوییەکە بەو ڕێژە کەمەی مڵکانە قەناعەتی کردووە کە ئەوەش هەر بەشی ئەوە بووە خۆیی پێ بژیی و دیوەخانەکەیی پێ بەرێوە ببات و شتێکی ئەوتۆی زیاد نەبێت واتە بەگ و ئاغاو شێخی کورد بە دەگمەن بوونەتە خاوەن سامانی گەورە، بەڵکو زیاتر جیاوازی ئەمان و جوتیاری هەژاری کورد ئەوە بووە کە ئەمان خۆیان کاریان نەکردووەو تا ئاستێکی دیاری کراو ژیانیان لەوان باشتر بووە بێگومان جوتیاری هەژاریش کە خاوەنی هیچ هۆیەکی بەرهەم هێنان نەبووە نەیتوانیووە ئەوەندە خۆی لەگەڵ زەویدا خەریك بکات کە بەرهەمێکی زۆری هەبێت هەروەها ئەوەشی بەلایەوە گرنگ بووە تەنیا ئەوە بووە کە ژیانی خۆی و خێزانەکەی دابین بکات.

لەلایەکی تریشەوە لەوساوە تەنانەت تاکو ئێستاش ئامێرو ئامرازو تەکنەلۆجیای کشتوکاڵ لە شێوەیەکی زۆر سادەدا گەیشتۆتە کوردستان و جوتیار زیاتر پشت بە هۆکارە کۆن و تەقلیدیەکانی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵ دەبەستێت بۆیە ناتوانێت بەرهەمێکی ئەوتۆ بهێنێت کە لە بەشی پێویستی خۆی زیاتر بێت. هەموو ئەم هۆکارانە بە درێژایی ژیانی کورد دەوری کاریگەریان بینیوە لە دروستکردنی قەناعەتی رازی بوون بە (بەشی خۆ و تەنیا بۆ ئێستاش) لە عەقڵ و هۆشی کورددا.

ئەوەش هۆیەکی سەرەکی لاوازی ئاستی بەرهەم هێنان و دروست بوونی بازاڕی ناوخۆو بەوپێیەش دروست نەبوونی ناوەندی ئابوریە لە کوردستاندا.

لە لایەکی ترەوە کورت بینی مرۆڤی کورد بە گشتی و بیرنەکردنەوەی لە داهاتوو، بە تایبەتیش لەم رووەوە خاوەن مڵکەکان تەنیا بۆ ئێستا ژیاون و هیچ پرۆژەیەکی ئایندەییان نەبووە هەتا لەو پێناوەدا بیر لە چاککردنی زەوییەکانیان و پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان نەکەنەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە سیستەمی فیودیالی کوردیدا کە دەسەڵاتی خێڵایەتی بالادەست بووە سەرۆک خێڵەکان ئەگەر بیریان لە زیادکردنی بەرهەم و دەوڵەمەندبوون کردبێتەوە ئەوا لەبری چاککردنی زەوییەکانیان و چاککردنی ئەو یاسایانەی کە پەیوەندییان بە مڵکانەو وەرزێری و رەنجبەرییەوە هەیە، لەبری ئەوەی هەوڵبدەن تەکنۆلۆژیای نوێ بهێننە بواری کشتوکاڵەوە، هەوڵیان داوە زەوی و زاری خێڵ و عەشیرەتەکانی تر داگیر بکەن کە ئەوەش زۆربەی کات بووەتە هۆی شەڕو شۆڕ لە ئاکامدا بەرهەمەکانی کشتوکاڵ و ئەوەڕگاکان سوتێنراون لە ئەنجامی ئەوەشدا زیانی گەورە لە هەردوو بواری کشتوکاڵ و ئاژاڵداری کەوتووە.
لە بری زیادبوونی بەرهەم، نەبوونی و قات و قڕی دروستبووەو ئەوەش ئەنجامەکەی بە تالانکردن و وێرانکردن و شەڕو شۆڕو خوێن رشتن کۆتایی هاتووەو جۆرێک لە ئاژاوەو ناسەقامگیری دروستکردووە.

ناسەقامگیریش بە پێچەوانەکردنەوەی وتەیەکی ئیبن خەلدون یەکێکە لە هۆیەکانی تێکچوونی پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەو عیمرانی مرۆیی کە لە راستیشدا سەقامگیری زەمینەی سەرەکی عمیران و ئاوەدانکردنەوە خۆش دەکات(١١) کشتوکاڵ و ئاژەڵداریش کە سەرچاوەی ئابوری کوردستان بوون.. تەنیا لە هێمنی و سەقامگیریدا مرۆڤ دەتوانێت پێیانەوە خەریك بێت و بەرهەمی زۆر بەدەست بهێنێت، بە پێچەوانەشەوە شەڕو ئاژاوەو ناسەقامگیری هۆی وێرانی و بێ بەرهەمین.
یەکێك لە هۆکارەکانی کەمی بەرهەم و کۆبوونەوەی لە کوردستاندا بە درێژایی مێژووی زانراو ناکۆکی و ئاژاوەی ناوخۆو شەڕو ئاژاوەی نێوان خێڵ و عەشیرەتەکان بووە.

لەلایەکی ترەوە لە دامەزراوی عەشیرەتدا(١٢) واتە لە دامەزراوی شێخ و سەیدەکاندا راستە شێخی عەشیرەت خاوەنی ملکێکی زیاترە لە ئەندامانی تر، بەڵام لەم دامەزراوەدا ئەندامانی تریش ملکی تایبەتی خۆیان هەیەو مەگەر بە دەگمەن ئەگینا لەسەر زەوی و ملکی شێخ کارناکەن. جگە لەوەش شێوازی پەیوەندی لە دامەزراوی شێخ و سەیدەکاندا ئاراستەیەکی ئاسۆیی هەیەو لە شێوەی هەرەمی پەیوەندی خێڵایەتیدا نیە. راستە شێخ لە ئاستێکی بەرزدایە بەڵام ئەو هەرەمەی دەسەڵات و بەڕێوەبردن کە لە دامەزراوی خێڵدا پێکدێت و ئاغاو بەگی سەرخێڵ لە لوتکەی هەرەمەکەدا دەبن و ئاراستەی پەیوەندی و ئاراستەی فەرمان لەوەوە بەرەو ئاستەکانی خوارەوە ئاراستە دەکرێت.
لە دامەزراوی شێخ و سەیدەکاندا ئاراستەی پەیوەندییەکان ئاسۆین و چەمکی فەرمانیش لەم دامەزراوەدا کەمتر دەبینرێت چونکە لەلایەك ئەندامانی ئەم دامەزراوە لە رووی ئەسەبەوە هەموو خۆیان لەیەك ئاستدا دەبینن، لەلایەکی تریشەوە هەریەکە بەشی خۆی ملك و زەوی هەیەو لە رووی ژیانی ئابورییەوە جۆرە سەربەخۆییەکی هەیەو وابەستەو ژێردەستەی شێخ نابێت. هەریەکە لە ئەندامانی ئەم دامەزراوەش لەسەر

ئەو بەشە زەوییەی هەیەتی کاردەکات و بەشی خۆی بەرهەم دێنێت. نە چاوی لەوەوە بووە زەوی بدات بە ملکانە چونکە زەوییەکەیان تەنیا بەشی خۆیان بووە، نە چاویان لەوەوە بووە کە زەوی شێخە خاوەن ملکەکەی خۆیان بکەن و ملکانە بدەن واتە قەناعەتیان بەو بەشە ملکە کەمەی خۆیان و بەو بڕە بەرهەمە کردووە کە لەسەر ئەو زەوییە بەرهەمیان هێناوە کە ئەویش تەنیا بەشی ژیانی سادەو ئاسایی خۆیان بووەو ئەمانە ئەوەندەیان بەرهەم نەهێناوە کە لە خۆیان زیاتربێت ئەوەش هۆیەکی تری کۆبوونەوەی بەرهەم و دروست نەبوونی بازاڕی ناوخۆو پێکنەهاتنی ناوەندی ئابوری بووە لە کوردستاندا، لە کاتێکدا هەم دامەزراوی عەشیرەت بەشێکی فراوانی کۆمەڵگای کوردی پێکهێناوە، هەم شێوازی ژیانی ئەمان کە لە پێش خێڵەکانەوە نیشتەجێ بوون کاری لەو خێڵانەش کردووە کە پێشتر کۆچەری بوون و لە دوایدا بە ناچاری نیشتەجێ بوون کە بەهەمان جۆرە قەناعەتەوە کاربکەن و ئەو قەناعەتەش بەربەستێك بووە لە بەردەم بەرهەم هێنانی زیاتردا.

# ناسەقامگیری کۆمەڵایەتیو سیاسی وەك كۆسپی بەردەم دروستبوونی ناوەندی ئابوری

کوردستان وڵاتێکە کەوتۆتە پانتاییەکی جوگرافی ئەوتۆوە کە ئەو شوێنە جوگرافیەی یەکەمین هۆکاری ناسەقامگیرییە بۆی. لەلایەك خاڵ و رێگەی پێکەوەبەستنی رۆژهەلات و رۆژئاوایە. لە لایەکی ترەوە لە رابردوودا کەوتۆتە نێوان کۆمەڵێ شارستانی دیارو گەورەوە، هەروەها لەمپەرێکە کە کۆمەڵە نەتەوەیەکی هێجگار جیاواز لە یەکتری جیادەکاتەوە. لەشکری (دە) هەزار کەسی گەزنەفۆن بەم خاکەدا تیپەڕی کردووە هەروەها ئەسکەندەری گەورەش لێرەوە هێرشی کردۆتە سەر ساسانیەکان. لە ململانێی نێوان میدو ئاشورییەکان و بابلی و ئاشورییەکاندا مەیدانی شەڕو پێکدادانی سوپاکان بووە.

لە فەتحی ئیسلامیدا سەرباری ئەوەی کە ئەم وڵاتە خۆی فەتحکراوە، هەروەها رێگای سوپای ئیسلامی بووە بۆ ناوچەکانی تری رۆژهەلات و باکور. دواتریش بەر هێرشی مەغۆلەکان بەرەو بەغدا کەوتووەو لە گواستنەوەی دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلامیشدا لە عەباسیەکانەوە بۆ تورکە عوسمانیەکان و لەگەڵ ئەو گواستنەوەیەی دەسەلاتیشدا سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان عوسمانی و سەفەوییەکان کوردستان بووەتە جێگای ململانێی نێوان ئەم دوو ئیمپراتۆرەو هەریەکەشیان کوردی ژێر سایەی دەسەلاتی خۆی لە دژی ئەویتریان بەکارهێناوە.

له مێژووی سەدەی بیستیشدا کوردستان یەکێك لەو وڵاتانە بووە کە گەورەترین ململانێ و ناکۆکی لەسەر دروستبووە تاکو لە ئەنجامدا بەشێوەیەکی ناشەرعی دابەشکراوە بەسەر چەند دەوڵەتێکداو بەردەوام کوردستان لە بارێکی پەشێو و ناسەقامگیردا ژیانی بەڕێکردووەو بەردەوام تارمایی شەڕ باڵی بەسەردا کێشاوەو کورد بە هیچ جۆرێك لە ئایندەی خۆی دڵنیا نەبووەو ئومێدی سبەینێی نەبووە، لە بارودۆخێکی وەهاشدا زەحمەتە مرۆڤ بیر لە بەرهەم هێنانی زیاد لە پێویستی خۆی بکاتەوە. چونکە لەلایەك ئومێدی سبەینێی نەبووە هەتا لەو پێناوەدا ئەمڕۆ رەنجێکی زۆر بدات و بەرهەمێکی زۆر بهێنێت، بە مانایەکی تر کورد هەمیشە بۆ ساتەوەختی ئێستا ژیاوەو بیری لە سبەینێ نەکردۆتەوە، جێگیربوونی ئەم بۆچوونەش لەلایەك بووەتە کۆسپ لە بەردەم بەرهەم هێناندا، لە لایەکی تریشەوە وای لە کورد کردووە ئەگەر بەرهەمێکی لەخۆی زیاتریشی هەبێت ئەوا ئەوەندە بەلایەوە گرنگ نەبێت و چۆنی بۆ رێکەوتبێت رەوانەی دەرەوەی سنورەکانی کوردستانی بکات یان لە دەرەوەی کوردستانەوە ئەو بەرهەمە رابکێشرێت. ئەوەش وایکردووە کە هیچ بنەمایەکی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا دروست نەبێت.

دیارە نەبوونی ناوەندی دەسەڵاتیش لە کوردستاندا دەوری کاریگەری بینیووە لەوەیدا کە ناوەندی ئابوری دروست نەبێت بەتایبەتی لە کاتێکدا کوردستان پێگەو رەوگەی هاتوچۆو بەژێر پێوەبوون بووە لەلایەن سوپاو هێزەکانی نزیك و دوورەوەو ئە وەش وایکردووە کە کوردستان جوگرافیایەکی بێ سنوور بێت واتە جوگرافیایەك کە بەرووی دەرەوەدا کراوە بێت و هیچ دەرگایەکی نەبێت هەتا بە رووی دەرەوەدا دابخرێت، بێگومان لە جوگرافیایەکی بێ سنوورو بێ ناوەندیکی ئەوتۆدا کە بە هێزێکی مادی و مەعنەوی هەموو بەشەکانی ئەو جوگرافیایە بەخۆیەوە ببەستێت و هەموو داهات و بەرهەم بەرەو ناوەندەکە خۆی

کێش بکات ناشێت ئابوری لە ناوەندا کۆببێتەوەو ناوەندی ئابوری پێکبهێنێت. هەر ئەو بێ سنوورەییەی کوردستان و نەبوونی ناوەندی دەسەلات تیایدا کە دیارە ئەو ناوەندەی دەسەلاتیش ناشێت بەبێ ناوەندی ئابوری پێکبێت وایکردووە کوردستان وەکو جوگرافیایەکی بێ خاوەن وەها بێت و لەهەمان کاتدا وەکو بۆشاییەکیش وەها بێت کە هیچ هێزێکی مادی و مەعنەوی لە خودی ئەو جوگرافیایەدا دروست نەبووە هەتا بەشەکانی پێکەوە ببەستێت، دروستبوونی ناوەندی ئابوری یەکەمین هۆکارە کە ئەو هێزە لە ناوەندی ئەو جوگرافیایەدا دروست دەکات کە رایەڵی پێکەوە بەستنی سەرجەم بەشەکانی ئەو جوگرافیایە دەستەبەر دەکات و یەکێتی ئەو جوگرافیایەو یەکێتی ئەو کۆمەڵەی کە لەسەری دەژی دەسەلمێنێت کە ئەو یەکێتی و یەکگرتنانەش لە مەرجە سەرەکیەکانی دروستبوونی دەوڵەتی کوردین.

# پەیوەندی نێوان کۆمەڵی ناوخۆیی کوردو کۆمەڵگاکانی تر "پەیوەندی بازرگانی"

دکتۆر سەمیر ئەمین دەڵێت: کۆمەڵگا مێژووییەکان ئەو پێکهاتانەن کە لەلایەکەوە زۆر شێوەی بەرهەم هێنانیان تێدا دەبێت، هەروەك لە لایەنی دووەمیشەوە تیایاندا پەیوەندی نێوان کۆمەڵگای ناوخۆیی و کۆمەڵگاکانی تر رێك دەخرێت(١٣) کەواتە لێرەوە ئەوە دەردەکەوێت کە لە نێوان کۆمەڵگای ناوچەیی و کۆمەڵگاکانی تردا کە دەشێ لە ئاستێکی پەرەسەندوتردا بن پەیوەندی ئابوری دەبێت ئەویش بریتی دەبێت لە: بوونی پەیوەندی بازرگانی مەودا دوور(١٤) با لەم روانگەیەوە بڕوانین و بزانین ئایا بازرگانی دەرەوە دەورێکی ئەوتۆی دەبێت لەسەر پەرەسەندنی ئابوری ناوخۆو دروستبوونی بازاڕی ناوخۆو بەوپێیەش دروستبوونی ناوەندی ئابوری.

ئەگەر سەرنجی ژیانی نیمچە دوورگەی عەرەبی پێش ئیسلام بدەین ئەوا دەبینین کە ئەم دوورگەیە سەرگەرمی بازرگانیەکی بەربلاو بوو لەگەڵ شامداو لەوێشەوە بۆ دنیای دەرەوەو دوورتر. تەنانەت لە ئایەتی قورئاندا باسی دوو وەرزی بازرگانی نیمچە دوورگە کراوە وەرزێ بۆ شام و وەرزێ بۆ یەمەن و باشووری نیمچە دوورگە. کە ئەویش لە ئایەتی "رحله الشتاء و الصیف"دا دەردەکەوێت نیمچە دوورگەی عەرەبی لە میانەی ئەو بازرگانیەی دەرەوەدا هەرچی پێویستییەکانی خۆی بووە

هێناویەتیە ناوەوەو ئەو شتەشی کە لە پێویستی خۆی زیاد بووە یان ئاڵوگۆڕی کردووە یان فرۆشتویەتی بەلاّم ئەم جوڵە بەردەوامە بووەتە سەرچاوەیەکی بەهێزی ئابوری لە وڵاتداو جۆرە عەقڵیەتێکی بەرهەم هێناوە کە ئارەزوومەندی کۆکردنەوەی بەرهەم و (ماڵ) بووە. دیارە لە هەر کوێش (ماڵ) کۆبێتەوە مانای وایە بنەمای ژیانی ئایندە دادەنرێت. زۆرجار دەشێ وڵاتێك نە وڵاتێکی پیشەسازی بێت، نە وڵاتێکی کشتوکاڵی و نە بەکاری ئاژەڵداریش بێت بەلاّم شوێنی جوگرافی و بوونی بە رێڕەوی بازرگانی نێوان وڵاتانی تر وای لێدەکات کە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئابوری بۆ دروست ببێت لە داهاتی باج و گومرگ. دیارە کوردستان نەبووەتە رێگای بازرگانی نێوان وڵاتان و نەیتوانیووە لەو رووەشەوە داهات کۆبکاتەوەو ئەو داهاتەش ببێتە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئابوری و لە ئاکامیشدا ئەو ئابورییە ببێتە بنەمایەك بۆ پەرەسەندن و گەشەکردنی ئابوری ناوخۆو لەوێشەوە بنەمای بازاڕی ناوخۆو ناوەندی ئابوری لە وڵاتدا پێك بێت.

دیارە کاتێ باسی دروستبوونی ناوەندی ئابوری دەکەین بە واتایەکی تر مەبەستمان دروستبوونی سەرمایەیە، هەندێ بۆچوون هەن کە پێیان وایە سەرمایەو دروستبوونی بازاڕی ناوخۆو بەو پێیەش دروستبوونی ناوەندی ئابوری لەژێر کاریگەری سەرهەڵدانی بازرگانیدا دروستبووە. لە کاتێکدا مێژووی سەرهەڵدانی بازرگانی کۆنەو لەمێژە هەر وڵاتە بەجۆرێك بازرگانی کردووە ئەگەر وڵاتێکی بەرهەم هێنەر بووبێت. بۆ نموونە ئەگەر کوردستان لە قۆناغی ژیانی خێڵایەتی و ژیانی کۆچەرێتی و گەرمیان و کوێستاندا بەرهەمێکی زۆری ئاژەڵداری و بەروبوومەکانی ئاژەڵداری هەبوایە ئەوا لە رێگای جۆرێك لە بازرگانی کردنەوە کورد یان خۆی ئەو بەرهەمانەی دەبردە دەرەوەو لە بەرامبەریدا پێداویستییەکانی تری خۆیی دەهێناو دەکڕی یان ئەو بەروبوومانەی دەگۆڕیەوە بە پول و پارەو بەو پێیەش پول و پارە دەهاتە کوردستانەوەو تیایدا

کۆنەبووەوە. یان دەشیا (بازرگانی) دەرەوە بۆ کڕینی ئەو بەرهەمانە بهاتنایەتە کوردستان و لە بەرامبەر ئەو بەرهەمانەدا یان پول و پارە یان پێداویستی‌یەکانی تری ژیانی خەڵکیان بهێنایە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا کوردستان دەبوو بە بازاڕێك بۆ ئاڵوگۆڕکردن، بۆ ناردنە دەرەوەی بەرهەمی زیادو هێنانی بەرهەمی پێویست کە لەو سەوداو مامەڵەیەشدا جۆرێك لە چالاکی پیشەسازی دروست دەبوو، جۆرێك لە بازاڕی ناوخۆی دروست دەکردو لە ئاکامی ئەوەشدا دەشیا لە لایەك عەقڵیەتی کۆکردنەوەی پارەو داهات لە کوردستاندا دروست ببوایە، لەلایەکی ترەوە عەقڵیەتی بەکارخستنی پارەو داهات دروست دەبوو. ئەوەی پارەو پولێکی هەبوایە هەوڵیدەدا پێداویستیەکانی ناوخۆ لە دەرەوە بەو پارەیە بهێنێت و لە ناوەوە ساغی بکاتەوە کە ئەوەش بنەمای دروستبوونی عەقڵی بازرگانی و بەکارخستنی پارەو پولە. کە دەشیا ئەوە رێگای بۆ سەرهەڵدانی پیشەسازی خۆش بکات و لە ئاکامی ئەوەشدا بنەمای بازاڕی ناوخۆ دابنرایە کە ئەوەش هەنگاوێکی گرنگ و سەرەتاییە بۆ دروستبوونی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا.

هەروەك لە قۆناغی خێڵایەتی و ژیانی ئاژەڵداریدا لەبەر کەمی بەرهەمی ئاژەڵداری ئەو جۆرە بازرگانیە دروست نەبووە، لە هەمان کاتدا لە قۆناغی ژیانی کشتوکاڵی و فیودیالیشدا دیسان لەبەر کەمی بەرهەمەکانی کشتوکاڵ لە کوردستاندا بازرگانی کردن بە بەرهەمەکانی کشتوکاڵەوە دروست نەبووە. هەتا لەم بوارەیانداو لە رێگای ئەو بازرگانیەوە پارەو سەرمایە لە کوردستاندا کۆببوایەتەوەو ئەوەش ببوایەتە بنەمای دروستبوونی بازاڕی ناوخۆ. بەهەر حاڵ کوردستان لە هیچ قۆناغێکی دیاری مێژوودا نەبووە بە رێگای بازرگانی نێوان دەوڵەتان، نە خۆیشی بووە بە وڵاتێکی بازرگانی، نە کۆمەڵگای کوردیش بووە بە کۆمەڵگایەکی بازرگانی هەتا لە سوودی بازرگانی پارەو سەرمایەیەکی زۆر لە کوردستاندا کۆببێتەوەو ئەو پارەو سەرمایەش ببێتە بنەمای دروستبوونی ئابوری و ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا.

# نەوت وەکو کۆسپێك لە بەردەم دروستبوونی ناوەندی ئابوری کوردیدا

راستە نەوت یەکێکە لە سەرچاوە هەرە گرنگەکانی ئابوری و هەر وڵاتێك ئەم سەرچاوەیەی هەبێت واتە یەکێك لە بنەماکانی دەوڵەمەندبوون و کۆبوونەوەی سەرمایەی هەیە. ئەگەرچی لە مێژووی نوێداو لەگەڵ دۆزینەوەی نەوتدا وڵاتانی دواکەتووی خاوەن نەوت دووچاری گەلێك کێشە بوون لەژێر فشاری دەوڵەتانی داگیرکەرو خاوەن هێزدا. هاتنی داگیرکەران بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەوڵدانیان بۆ داگیرکردنی زۆربەی ئەو ناوچەو هەرێمانەی کە کانگای نەوتن لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ئاکامەکەی بەوە شکاوەتەوە کە زۆربەی ناوچە نەوتیەکان بکەونە ژێر سایەی دەسەڵاتی داگیرکەرانی رۆژئاواوە.

بە گوێرەی کوردستان نەوت نەك هەر بووە بەهۆی داگیرکردنی بەڵکو هۆکارێکی سەرەکیش بووە بۆ دابەشکردنی لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی ئەویش لەو روانگەیەوە کە کوردستان وڵاتێکی نەوتی‌یە و لەبەر ئەوە لەژێر کاریگەری دوو هۆکاردا دابەشکراوە. یەکەمیان بۆ رازی کردنی دەوڵەتانی تازە دروستکراوی ناوچەکەو بۆ ئەوەی هەریەکەیان بەشێك لەو داهاتە گرنگەیان بەربکەوێت، دووەم بۆ ئەوەی بواری دروستبوونی تاکە

ئیدارەیــەك لــە كوردســتانداو بەوپێیــەش بــواری دروســتبوونی تاكــە ناوەندێكی ئابوری نەبێت.

مێژووی دۆزینەوە ی نەوت لە كوردستان و ناوچەكەشدا ئەوەندە كۆن نیەو دەگەڕێتەوە بۆ چارەكی یەكەمی ئەم سەدەیەو لەو سەروبەندەدا كە جارێكی تـر كوردسـتان دابەشـكرایەوە بەسـەر دەوڵەتـە كـۆن و تـازە دروستكراوەكانی ناوچەكەدا. ئەگەر بهاتبایەو كورد خۆی خاوەنی وڵاتی خۆیـی و خـاوەنی ئیـدارەو بڕیـاری خـۆی بوایــەو نــەوت لــە خزمــەتی بنیادنـانی وڵاتـدا بەكاربهاتبایـە ئـەوا كوردسـتان دەبـوو بـە یـەكێك لــە دەوڵەمـەندترین و گەشەسەندوترین وڵات لــە ڕووی ئابورییــەوەو دەشـیا هـەر ئـەو بنیادە ئابورییەش ببوایەتـە زەمینەیـەكی لـەبارو هەلومـەرجی پەرەســەندو پێشـكەوتنی كۆمەڵایــەتی كـوردی بـە شـێوەیەكی تـەواو بڕەخساندایە.

بەڵام لەبەر ئەوەی لەلایەك كورد خۆی خاوەنی وڵاتی خۆی نەبووەو خۆی وڵاتـی بەڕێوە نەبردووەو یـەك نـاوەندی یـەكگرتوی دەسـەڵات لـە كوردستاندا دروست نەبووە، داهاتی نەوتیش نـە بۆ كـورد بـووەو نـە لـە كوردستاندا كۆبۆتەوەو نەبوویشە بە بنەمایەك بۆ پێكهێنانی ژێرخانی كۆمەڵایـەتی كـوردی و نــە زەمینەیــەكی پتــەو و بــەهێزو دەوڵــەندی دروستكردووە. بەڵكو بە پێچەوانەوە نەوت هەر لەگەڵ دۆزینەوەیدا لە كوردستانداو تەنانەت پێش دەرهێنانیشی زیـاتر كوردسـتانی كردۆتـە جێی چاوتێبڕینی دەوڵـەتانی خـاوەن دەسـەڵاتی ئەركاتـە بـە گشـتی و بەریتانیا بە تایبەتی، لە لایەكی تـرەوە دەشـێ بڵێین نـەوت دەورێكـی دیـاری بینیـووە لــە شـێوازی دابەشـكردنی دووەمــی كوردســتانداو كوردســـتان بـــەجۆرێك دابەشـكرا كــە هاوســەنگیەك لـــە ڕووی سـەرچاوەكانی نـەوت و سـەرچاوە كـانزایی و مـادە خاوەكانی تـرەوە لـە نێوان بەشەكانیدا هەبێت. دیارە هەریەكە لەو بەشانەش كە خرانـە سـەر یەكێك لە دەوڵـەتانی دراوسـێی كوردستان، ئابوریەكەیشیان بە هـەموو

سەرچاوەکانیەوە بەرەو ناوەندی ئەو دەوڵەتانە ڕاکێشران و دابەشکران واتە ئابوری کوردستان لە پرۆسەی دابەشکردندا بوو بە چوار بەشەوەو هەر بەشێکیشی بە ئاراستەیەکی جیاواز لە بەشەکانی ترو بەرەو دەرەوەی کوردستان واتە بۆ ناوەندی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان ڕاکێشراو لەم حاڵەتەشدا ئابوری کوردی لە سنوری کوردستاندا نامێنێتەوەو لەژێر کاریگەری جوڵەو میکانیزمی سروشتی بەڕێوەبردنی کوردستان لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە ئابوری کوردستانیش چۆتە ژێر ڕکێفی ئەو دەوڵەتانەوە. ئەو دەوڵەتانەش ئابوری کوردستانیان کردۆتە بنەمایەك بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی سەرچاوەو بینای ئابوری خۆیان. لە کاتێکدا کە ئاستی ئابوری ئەو دەوڵەتانەو ناوەندی ئابورییان چەند بەهێز بێت زیاتر زیان لە کورد دەدات چونکە لەو حاڵەتەدا کوردستان کە ناوەندێکی بۆشە لە ڕووی ئیدارییەوە. ئەو ناوەندانەی ئەوان هەرچی بەرهەم و داهات و مادەی خاویشە لە کوردستانەوە بەرەو لای خۆیان کێش دەکەن. هەڵبەت نەوحی ڕاکێشانی نەوتی کوردستان لەلایەن ئەو ناوەندانەوە زیاتر ڕێگای خۆشکرد بۆ ئەوەی ئەو ناوەندانە سەرچاوەکانی تری ئابوریش بەرەو لای خۆیان ڕابکێشن. بەتایبەتی یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانەی کە بوو بەهۆی ئەوەی کە ولایەتی موسڵ بخرێتە سەر دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراق نەوت بوو، بە تایبەتی بەریتانیا دەیویست عێراق کە لە ژێر ئینتیدابی ئەودا بوو گەورەترین سەرچاوەی نەوتی هەبێت، دیارە فەڕەنساش نەوحی ئەوەی هەبوو کە بەشێك لە سەرچاوە نەوتیەکانی سنووری ولایەتی موسڵ بکەوێتە سنووری سوریاوە کە لە ژێر ئینتیدابی ئەودا بوو. "هەریەکە لە هاوپەیمانەکانی دوای جەنگی یەکەم دەیویست بەشێکی دیاری کراوی لەو ڕووبەرە فراوانەی ئاسیای ژێر سایەی دەسەڵاتی پێشتری ئیمپراتۆری عوسمانی دەست بکەوێت کە ئەوەش هەموو ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کە ئێستا عێراق پێکدێنن. دەشیان ویست ئەو ناوچەیەی

دەستیان دەکەوێت لە رووی ئابوری و ستراتیژیەوە ناوچەیەکی گرنگ بێت(١٥). کە هەر ئەم تموحە بوو لە بنەرِتدا ولایەتی موسلّی خستە سەر دەولّەتی تازەو درەستبوونی عیراق و ناوچەکانی تری کوردستانیشی بەش کرد. کە سەرچاوەی سەرەکی ئەو ئابورییەش کە باسی دەکرێت نەوت بوو. لێرەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە نەوت دەورێکی کاریگەری هەبووە لەوەیدا کە کوردستان لە رووی سیاسی و ئیدارییەوە دابەش بکرێت، دیارە دابەشکردنی سیاسی و ئیداریش راستەوخۆ بوەتە هۆی دابەشکردنی سەرچاوەکانی ئابوری ئەم ولاتە. کە لە راستیشدا هەموو دابەش بوونێك بە دژی دروستبوونی ناوەندی ئابوری و بازارِی ناوخۆیە. بۆیە لێرەدا دەتوانین بلّێین ئەگەر تموحی نەوت سەرچاوەکانی تری مادەی خاو نەبوایە رەنگە کوردستان لە دوای جەنگی یەکەم و هەلّوەشاندنەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی نەبوایەتە جێگای چاو تێبرِینی دەولّەتان و ئەنجام ئەوەندە ململانێی لەسە ردروست نەبوایەو بەو شێوەیە دابەش نەکرایە. خۆ ئەگەر بهاتبایەو کوردستان دابەش نەکرایە ئەوا سەرباری بۆشایی لە رووی ئیدراری و تەنانەت شارستانیشەوە ئەوا هێشتا دەشیا ئەو داهاتە کەمەی ئابوری و بەرهەم هێنانی کشتوکالّ و ئاژەلّداری ببوایەتە بنەمایەك بۆ پێکهێنانی بازارِی ناوخۆو لە ئاکامیشدا سەرمایە لە کوردستاندا کۆببوایەتەوەو ناوەندی ئابوری پێکبهاتەیەو بەوپێیەش ئابوری وەکو هێزی بزوێنەری مێژوو ببوایەتە فاکتەری جولّە دروستکەرو پەرەسەندنی کۆمەلایەتی کوردی و لەوێوەو لەسەر ئەو بنەمایە زەمینەی دروستبوونی دەولّەتی کوردی لە رووی پەرەسەندنی کۆمەلایەتیەوە پێکبهاتبایە.

دیارە نەوت جگە لەوەی دەوری سەرەکی بینیوە لە دابەشکردنی کوردستانداو بەو پێیەش زەمینە خۆشکردن بۆ تێکشاندنی بنەمای دروستبوونی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا، هەروەها بەگوێرەی ولاتانی دواکەوتووی ناوچەکە بەگشتی و لەگەلّ ئەوەشدا کوردستان

داهاتی نەوت دەوریکی سەرەکی بینیووە لە شێواندنی گەشەی ئاسایی کۆمەڵگاکاندا، لەلایەك داهاتێکی زۆر کۆبۆتەوەو بەڵام لە لایەکی ترەوە ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی زۆر لەدوا بووە، ئەوەش لەلایەك ئەو کۆمەڵگایانەی کردووە بە کۆمەڵگای تا رادەیەك مشەخۆر، واتە بەبێ ئەوەی بەرهەمێکی ئەوتۆ بهێنن گەورەترین سامانیان بەسەردا کۆبۆتەوە، ئاستی پەرەسەندو گەشەی فیکری و عەقڵی و پێگەیشتنی هەست و هوشیاری نەتەوەیشیان لەو ئاستەدا نەبووە کە بتوانرێت ئەو سامانە زۆرە لە بنیادنان و دروستکردنی وڵات و پرۆژەی زانستی و تەکنەلۆژیدا بەکاربهێنن، بە مانایەکی تر لەم وڵاتانەدا سەرمایە کۆبۆتەوە (دیارە کوردستان لەبەر ئەوە دەوڵەتی خۆیی نەبووە شتێکیش نەبووە ناوی سەرمایەی کوردی بێت چونکە سەرمایەی نەوتی کوردستان تێکرا چۆتە ناوەندی ئەو دەوڵەتانەی کە داگیریان کردووە) بەڵام ئەو چینە کۆمەڵایەتیەی کە خاوەندارێتی سەرمایە دەکات پێنەگەیشتووە، لە ئاکامی ئەوەشدا سەرۆك خێڵەکان و شێخەکانی عەشیرەت بوونەتە خاوەنی ئەو سەرمایەیەو بەرێوەیان بردووە، دیارە ئەوەش بارێکی نەگونجاو و نادروستە کە عەقڵی خێڵ و ستراتیژی خێڵایەتی سەرمایەی قۆناغی تەکنەلۆژیاو سەرمایەداری بەرێوە ببات. لە کاتێکدا سەرمایەی لەو جۆرە بەرهەمی قۆناغی سەرمایەداری و ئیدارەی چینی بۆرژوای سەرمایەدارە کە ماهیەت و گەوهەری بوونی ئەو چینە بۆرژواش ناسیونالیزمە. دیارە عەقڵی خێڵ و ستراتیژی خێڵیش لەخوار ئاستی سەرهەڵدانی ناسیونالیزمەوەیەو تەنیا ناسیونالیزم تەوحی ئەوەی هەیە کە سەرمایەی نەتەوەیی بپارێزێت و بیخاتە کارەوە لە خزمەتی بەرژەوەندی نەتەوایەتیدا بەڵام لە وڵاتانی دواکەوتووی خاوەن نەوتدا لەبەر ئەوەی ناسیونالیزم پێنەگەیشتووە دەبینین لە بری ئەوەی چینێکی کۆمەڵایەتی ئیدارەی ئەو ئابوریەو ژیانی کۆمەڵایەتی بکات شێخ یان سەرخێڵێك دەیکات کە باشترین نموونەش هەموو شێخ نشینە

نەوتیەکانی دووڕگەی عەرەبە، دیارە وڵاتانی تری عەرەبیش کە پاش چەندین ساڵ ناسیونالیزمێکی شۆڤێنی باڵی بەسەردا کێشان هەر لەسەر هەمان بنەما دروست بوون. لە بنەڕەتیشەوە دروستبوونی ئەو ناسیونالیزمە شۆڤێنیەی عەرەب پەیوەندی بە بنەمای ئابوری دروستبوونیەوە هەیە، لەبەرئەوەی بە سروشتی و لە ئەنجامی گەشەی ئابوری و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا دروست نەبووەو لە ماوەیەکی زەمەنی کورتدا ئابوری نەوت دروستی کردووە بۆیە لە بارێکی شلۆق و توندڕەودایەو سیمای چینایەتی دیار نیەو تێکەڵاوێکە لە سەرجەم چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان کە زۆربەیان لەو تێکەڵاوبوونەدا بنەماکانی چینایەتی خۆیان ون کردووە.

مەبەستمان لەم قسانە ئەوەیە کە چۆن ئابوری نەوت دەوری هەبووە لە شێواندنی پەرەسەندنی سروشتی کۆمەڵگادا دیارە بە گوێرەی کورد لەبەر ئەوە ی ئەو داهاتە نەوتیە لای خۆی کۆنەبووەتەوە مەسەلەکە جیاوازە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرئەوەی کوردستان بەو وڵاتانەوە لکێندراوە کە ئەو داهاتە نەوتیەیان لاکۆبۆتەوەو هەمان سیستەمی سیاسی و ئیداری و ئابوویش کوردستانی بەڕێوەبردووە بۆیە لە ئاستێکدا نەوت و بەرهەمی نەوت هەر دەوری هەبووە لە شێواندنی گەشەی کۆمەڵایەتی کوردیشدا. بەتایبەتی لەو ڕوانگەیەوە کە لە ئاکامی دابەشبووندا کە نەوتیش وەکو یەکێك لە هۆکارەکانی دابەشبوون سەیر دەکرێت، ئابوری کوردستان بەرەو چوار ناوەندی ئابوری جیاواز ڕاکێشرا کە نە هیچیان ناوەندی ئابوری کوردی بوون و نە هیچیشیان لەسەر جوگرافیای کوردستان بوون. بێگومان ڕاکێشران و گواستنەوەی ئابوری کوردستان بۆ دەرەوەی سنووری کوردستان لە ڕاستیدا دژی پرۆسەی کۆبوونەوەی ئابوری و داهاتە لە کوردستاندا واتە لە پلەیەکی باڵاتردا ڕاکێشانی ئابوری کوردی بۆ دەرەوەی کوردستان دژی دروستبوونی ناوەدی ئابوری و بازاڕی هاوبەشە لە کوردستاندا.

دیاره داگیرکەرانی کوردستانیش بە وریاییەوە هەوڵیانداوە کە کوردستان نەبێتە وڵاتێکی پیشەسازی، هەر بۆ نموونە لە عێراقدا سەرجەم مادە خاوەکانی ئاسن و شوشەو نەوت لە کوردستانەوە گواستراونەتەوە بۆ سنووری عێراقی عەرەبی و کارگەو کارخانەکانی شوشەو ئاسن و بیترۆکیمیاوی کە مادە خاوەکەیان لە کوردستاندا بوو کەچی ئەم کارگەو کارخانانە لە بەغداو رومادیو بەسرەو شوێنەکانی تری عێراق دروستکراون، بۆ ئەوەی کوردستان نەبێتە وڵاتێکی پیشەوسازی و بنەمای دروستبوونی بازارو ناوەندی ئابوری تێدا دروست نەبێت.

لە تەوەری یەکەمی ئەم باسەدا لەوە دواین کە چۆن ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا دروستنەبووە، هەروەها باسی دەوری ستراتیژی (تەنیا بەشی خۆم)مان لە شێوازی بەرهەم هێناندا لای کورد کردو لەو هۆکارانەیش دواین کە بەربەست بوون لە رێگای دروستبوونی بازاری ناوخۆو ناوەندی ئابوری کوردیدا بەڵام زیاتر گرنگیمان بە هۆکارە ناوخۆییەکان دا. لێرە بەدواوە باسی رۆڵی لەبەر رۆیشتنی ئابوری و لە مێژووی نوێشدا باسی کۆلۆنیالیکردنی ئابوری کوردی دەکەین کە ئەم دوو لایەنەش لە گەوهەردا نزیکن لە یەکتری و هەمان ماناو واتایان هەیە لە رووی پیادەکردن و دەرئەنجامەکانیانەوە.

## مەبەست لە لەبەرڕۆیشتنی ئابوری چییە؟

مەبەست لە لەبەرڕۆیشتنی ئابوری ئەوەیە کە بەرهەم و داهاتی ئابوری ولاتێك یان نەتەوەو کۆمەڵگایەك هەر لەگەڵ بەرهەم هێنانیدا لە سنووری ولاتی خۆیدا نەمێنێتەوەو لەلایەن ولاتان و دەوڵەتانی ترەوە ئەو ئابوری و داهاتە ئابوریيە رابکێشرێت و بگوازرێتەوە بۆ دەرەوەی سنوری ئەو ولاتە خۆی کە بەرهەمەکەی لێهێنراوەو خودی ولاتی بەرهەم هێن هیچ کەڵك و سودێك لەو بەرهەم و داهاتە ئابوریە وەرنەگرێت. بە مانایەکی تر لەبەرڕۆیشتنی ئابوری کردارێکە بە دژی کۆبوونەوەی ئابوری و دروستبوونی بازاڕی ناوخۆو بەوپێیەش دژەکرداری دروستبوونی ناوەندی ئابورییە لە ولاتدا.

لە پرۆسەی لەبەرڕۆیشتنی ئابوریدا ولاتی بەرهەم هێن سەرباری بەرهەم هێنان هیچ داهاتێکی تێدا نامێنێتەوە بەڵکو هەر لەگەڵ بەرهەم هێناندا لەلایەن دەرەوە ئەو بەرهەمە بە رێگای جۆراوجۆر رادەکێشرێت. هۆی هەرە سەرەکی ئەم پرۆسەیەش لەسەر بنەمای دووانەیەك دادەمەزرێت دووانەی (دەسەلات/ بۆشایی) یان دووانەی (پێشکەوتن/ دواکەوتن)، یان دووانەی (شارستانی/ سەرەتایی بوون) و لە پشتی هەموو ئەمانەشەوە دەتوانین بڵێین دووانەی (ئامادەبوون/ ئامادە نەبوون) راوەستاوە. ئەو ولات و کۆمەڵگاو نەتەوەی کە ئامادەبوونی هەیە لە رووی دەسەلات و شارستانی و پێشکەوتنەوە دەتوانێت ئابوری ئەو کۆمەڵگایەی دراوسێی یان ئەو ولاتەی دراوسێی بمژێت کە لەو بوارانەدا

ئامادەبوونی نیە. ئەگەر وڵاتێک ئامادەبوونی هەبێت مانای وایە ناوەندی ئابوری هەیە، بە پێچەوانەشەوە وڵاتی نائامادە ناوەندی ئابوری نیە. دیارە ناوەندی ئابوریش توانای ئەوەی هەیە کە ئابوری لە هەموو رووبەرێکی بێ ناوەندەوە بەرەو لای خۆی رابکێشێت، لە بەرپێشتنی ئابوریش لە کوردستاندا بە شێوەیەکی سروشتی بەرئەنجامی ئەو هاوکێشەیە. بوونی دەسەڵات و شارستانی و ئامادەبوون لە دەورووبەری کوردستان و نەبوونی لە کوردستاندا یان بە واتایەکی تر لەبەرپێشتنی ئابوری لە کوردستاندا دەرئەنجامی ئامادەبوونە لە وڵاتانی دەورووبەری کوردستانداو نائامادەبوون لە کوردستاندا، یان دەرئەنجامی بوونی ناوەندی ئابورییە لە وڵاتانی هاوسنووری کوردستان و نەبوونی لە کوردستاندا، لە بارەی لەبەرپێشتنی ئابوری کوردییەوە مەسعود محەمەد دەڵێت: بە درێژایی چەند هەزار ساڵێک کوردستان کەوتۆتە نێوان سێ هێزی زلەوە. فەرمانڕەوایی ئێران و دەسەڵاتی بابل و ئاشوورو دەسەڵاتی رۆمەکان ئەم سێ ناوچە زلەی دەسەڵات کە کوردستانیان گرتۆتە نێوان خۆیانەوە هەریەکەیان بەروبووم و داهاتی کەرتێک لە کوردستانی گەورەیان بۆ خۆیان راکێشاوەو مەودایان نەداوە ئەو داهاتە لە کوردستاندا بمێنێتەوەو ببێ بە ماکی بنیادنانی دەسەڵاو حوکمڕانی(١٦).

لەم وتەیەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لەبەرپێشتنی ئابوری لە کوردستاندا مێژوویەکی کۆنی هەیەو هەر بەو پێیەش دەشێ بە یەکێک لەو هۆکارە سەرەکیانە دابنرێت کە لە دێرزەمانەوە سروشتی گەشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیان شێواندووەو نەیان هێڵاوە کورد بە سروشتی قۆناغەکانی پەرەسەندنی خۆی ببڕێت و هەر هیچ نەبێت لە قۆناغی سەرهەڵدانی بۆرژوای نیشتمانیدا دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی دروست بکات.

لەو سەردەمەدا کە لە هەریەکە لە میزۆپۆتامیاو وڵاتی فارس و رۆم دا دەوڵەت هەبوو لە کوردستاندا دەوڵەت نەبوو، واتە کوردستان لە رووی ئیداری و سیسایەوە وەکو بۆشاییەك وابووە، لە کاتێکدا کە دەسەڵاتی ئیداریش لە وڵاتێکدا بوونی نەبێت ئەوا دەسەڵاتەکانی دەوروبەر دەتوانن بە ئارەزووی خۆیان تۆرەکانی دەسەڵاتیان هەڵبدەنە ئەو ناوچەو وڵاتەوەو چیان بوێت تیایدا ئەنجامی بدەن هەر بەم پێیە هەریەکە لەو دەسەڵاتانە چیان ویستووەو چۆنیان ویستووە لە کوردستاندا ئەنجامیان داوە کە مێژینی ئابوری کوردستان یەکێکە لەو کارە سەرەکیانەی کە ئەو دەوڵەت و دەسەڵاتانە چ بە نەخشەو پلان بووبێت یان لە خۆوەو بێ هیچ نەخشەو بەرنامەیەك ئەنجامیان داوە. مەبەست لە نەخشەو پلان ئەوەیە کە خودی ئەو دەوڵەتانە بەشێوازێك کۆڵنیالی ئابوری کوردستانیان کردبێت یان بەبێ نەخشەو بەرنامە لەبەرئەوەی لەوێ دەوڵەت و دەسەڵات هەبووە، لە لایەك پێویستبوونی خەڵکی کوردستان بە بەرهەمە سادەکانی پیشەسازی ئەو سەردەمەوە لە ئامێرەکانی کشتوکاڵ و پۆشاك و ئاژەڵداری چ پێویستی دەوڵەتەکان بە بەرهەمەکانی کشتوکاڵ و ئاودێریو ئاژەڵداری وایکردووە کە سەرجەم بەرهەمەکانی ئابوری کوردستان لە بەرامبەر ئەو پێدتویستیە ساکارانەی پیشەسازیدا بگوازرێتەوە بۆ بازارەکانی ئەو دەوڵەتانەو بە هیچ شێوەیەك بەرهەم لە ناوەوەی کوردستان کۆنەبێتەوە. ئەم ئاڵوگۆڕەیەش کە زیاتر تیایدا دەوڵەتانی دەوروبەری کوردستان سوودیان وەرگرتووە هەر ئەوە نەبووە کە ئابوری لە کوردستاندا کۆنەبێتەوەو نەبێت بە زەمینەی مادی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا پشت بەستن بە بازارەکانی ئەوان وایکردووە کە کورد خۆی بیر لە دروستکردنی شتە سادەو ساکارەکانی بەرهەمی پیشەسازی سەرەتایش نەکاتەوە کە زیاتر بریتی بوون لە پێداویستییەکانی کشتوکاڵ و ئاودێری و بەڵکو کورد لە حاڵەتێکدا بووە کە هەمیشە چاوی لەوەوە بێت کە ئەو پێداویستیانەی

له دەرەوە بۆ بێت. ئەمەش لە ئاکامدا بۆتە هۆی ئەوەی کە پیشەسازی لە کوردستاندا دەرنەکەوێت و بە زاراوەی ئابوورییانە کوردستان لە رووی ئابوورییەوە ببێتە وڵاتێکی پاشکۆ. کە لەگەڵ رۆیشتنی کاتدا ئەم پرۆسەیەش وایکردووە کە کۆمەڵگای کوردی تا رادەیەك ببێتە کۆمەڵگایەکی بەکارهێنەر نەك بەرهەم هێنەر لە رووی بنەماکانی پیشەسازییەوە کە ئەوەش کاریگەرییەکی ئاشکرای لەسەر عەقڵ و هۆشی کورد هەبووەو وایلێکردووە بەردەوام چاوی لە ئەوانی ترەوە بێت و چاوەڕوانی بەرهەم و دروستکردنی ئەوانی تر بێت ئەوەش لە ئاستی هەست و نەستی کورددا ئاسەوارێکی نێگەتیفی هەبووەو کردویەتی بە پاشکۆو لە بەردەم چاوەڕوانی هەمیشەییدا رایگرتووە، چاوەڕوانی هەموو بڕیار بۆ دانێك و هەموو جوڵەو ئاراستە جوڵەیەك کە دەشێ لە بەری بگرێت.

# ئەو هۆکارانەی کە ڕێگایان بۆ لەبەرڕۆیشتنی ئابووری کوردستان خۆشکردووە

چەند هۆکارێك ڕێگایان بۆ لەبەرڕۆیشتنی ئابوری کوردستان خۆشکردوە. پێشتر ئامارەمان بۆ بوونی دەسەلات لە دەورووبەری کوردستان و نەبوونی دەسەلاتی ئیداری و سیاسی لە کوردستاندا کرد. بەلام چەند هۆکارێکی تریش لەم بوارەدا دەوریان بینووە لەوانەش تۆپۆگرافیای کوردستان و شوێنی دروستبوونی شار لە کوردستانداو ناوچە کشتوکالیەکانی کوردستان و هەروەها هۆکارەکانی فەتح و داگیرکردنی کوردستان.

ئەگەر سەرنجی تۆپۆگرافیای کوردستان بدەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە کوردستان تۆپۆگرافیایەکی نالەباری هەیە.. ولاتی کوردان بانێکی چیایی یەو زۆربەی بەشەکانی رووت و بەردەلانە، یان بە دارستان

داپۆشراوە(١٧) هەروەها مینۆرسکی دەلێت بە شێوەیەکی گشتی ئەتوانین بلێین کوردو چیا لێك جیانابینەوە. هەر لەگەل دەشت دەستی پێکرد ئیتر کوردەکان بەجێی دێلن بۆ عەرەب و تورك، تا نزیك دەریاچەی وانیش بۆ ئەرمەنیەکان(١٨). مارتن ڤان برۆنسنیش دەلێت: ناوەندی کوردستان لە چیای سەخت و یاخی دەست پێنەگەیشتوو پێکهاتووە(١٩) هەروەها تۆمابوا دەلێت: کوردستان بریتی یە لە بەشی

سەرەکی ئەو ناوچە چیاییەی کە دەکەوێتە نێوان دەریای رەش و دەشتەکانی میزۆپۆتۆمیاوە لەلایەکەوەو چیای تۆرۆس و دەشتی ئێرانی لە لایەکەی ترەوە(٢٠). هەروەها خالفین دەڵێت: کوردستان وڵاتێکی شاخاوییە کە ناوەندەکانی چیاکانی کوردستان، داگیریان کردووە(٢١).

هەموو ئەم وتانە دەریدەخەن کە تۆپۆگرافیای کوردستان سەرجەم لە چیاو بان و هەردو شیوو دۆڵی قوڵ و دەشتی تەسك پێکهاتووە کە هەموو ئەمانەش لەلایەك بۆ کشتوکاڵ و ئاودێری و ئاژەڵداری گونجاو نین و بەرهەمێکی زۆریان تیادا بەرهەم ناهێنرێت. لە لایەکی ترەوە لە تۆپۆگرافیایەکی وەها نالەباردا نە بواری شار دروستبوون بە باشی هەیە نە بواری دروستبوونی ناوەندی دەسەڵات و ناوەندی ئابوری، بەتایبەتی لە کاتێکدا ناوەندی کوردستان وەکو قەڵایەك وەهایەو بەشی زۆری سەخت و دژوارەو لە رووی دیمۆگرافیەوە رێژەیەکی کەم دانیشتوان دەکەونە ناوەندی کوردستانەوەو بە پێچەوانەوە لەبەر ئەوەی سنوورەکانی کوردستان بەهۆی بوونیدەشتی زیاترو زەوی کشتوکاڵی لەبارترەوە بوونەتە جێگای نیشتەجی بوون و شارە دیارەکانی کوردستان بە رێژەیەکی ئاشکرا کەوتوونەتە هێڵی سنوورەییەوەو هەم بەرهەم هێنان بە رێژەیەکی زیاتر لە نزیك سنورەکانەوەیە هەم بە هۆی جێگای شارەکانەوە بەرهەمی کوردستان زیاتر لەو سنوورانەدا یان لە نزیك سنوورەکان کۆدەبێتەوەو لەبەرئەوەش هێزێك نیە ئەو بەرهەمانە بەرەو ناوەندی کوردستان رابکێشێت بۆیە هێزەکانی دەرەوەی کوردستان ئەو داهات و بەرهەمە ئابوریانە بەرەو لای خۆیان کێش دەکەن و بە ئاسانی رایان دەکێشنە دەرەوەی سنووری کوردستان، ئەمەش زیاتر پرۆسەی لەبەر رۆیشتنی ئابوری برەو پێدەدات کە پرۆسەیەکە بە دژی مانەوەی ئابوریە لە کوردستانداو هەر بەوپێیەش دژی دروستبوونی ناوەندی ئابوریە لە کوردستاندا.

له پاڵ ئەم هێزی کێشکردنەی دەرەوەدا شێوازی سروشتی لێژی زەوی کوردستان لە رووی تۆپۆگرافیاوە بە ئاراستەی دەرەوە هۆکارێکی تری یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی ئەو داهات و بەرهەمی ئابوریە نەتوانرێت لە دەشتەکانی نزیك سنوورەکانەوە بگوێزرێتەوە بۆ ناوەندی کوردستان لە کاتێکدا نە رێگاوبانی گواستنەوە لە مێژەوە بۆ ئێستا وەها ئاسان بووە، نە ناوەندی کوردستانیش ئەو هێزی کێشکردنەی هەبووە. نە ناوەندی کوردستانیش لە رێگایەکی رێکخراو و بەرنامە بۆ دارێژراوەوە بە وڵاتانی دەرەوەوە بەستراوە هەتا ئەو بەرهەمانە لە رێگای بازرگانیەوە بگوازرێنەوە، نە لە خودی ئەو ناوەندەشدا توانای سەرف کردنی ئەو بەرهەمە هەبووە لەبەر لاوازی دیموگرافی لە ناوەندی کوردستاندا نە بازاڕی ناوخۆش لە ناوەندی کوردستاندا دروستبووە بۆ کۆکردنەوەو بەکارخستن و بەکاربردنی ئەو بەرهەمانە نە پیشەسازیش هەبووە هەتا بەرهەمە سەرەتاییەکان و مادە خاوەکان بەکاربهێنێت. لەبەر ئەم هۆیانە داهات و بەرهەمی ئابوری کوردستان بە ئاراستەی سنوورەکان جوڵاوەو، لەوێشەوە هێزی دەسەڵات و ناوەندە ئابورییەکانی دەوروبەر کێشی کردووەو لە کوردستاندا نەماوەتەوە هەتا ببێت بە ماك و بنەمای دروستبوونی دەسەڵات.

دیارە ئەم پرۆسەی راکێشانی ئابوری کوردستان لە دێرزەمانەوە بەردەوام بووەو هەروەك مەسعود محەمەد دەڵێت لە سەردەمی رۆم و بابلی و ئاشوری و ساسانیەکاندا پرۆسەی راکێشانی ئابوری کوردستان بە ئاشکرا دیاروبوەو رێگای نەداوە بەرهەم لە کوردستاندا کۆببێتەوە. لە قۆناغی فەتحی ئیسلامیشدا راکێشانی ئابوری کوردستان لە شێوەو شێوازێکی تردا ئەنجام دراوە.

لە قۆناغی فەتحی ئیسلامی و دەسەڵاتکردنی سوپای ئیسلام بەسەر کوردستاندا دیسان چەند هۆکارێك رێگایان لە کۆبوونەوەی ئابوری لە کوردستاندا گرتووەو بواریان نەداوە ناوەندی ئابوری تێدا دروست

ببێت. ئەوە شتێکی ئاشکرایە سوپای هەر دەوڵەت و وڵاتێکی بێگانە، بچێتە وڵاتێکی ترەوە لە قۆناغی یەکەمدا لەگەڵ دەسەڵاتکردنی سەربازیدا هەوڵدەدات دەسەڵاتی ئابوری و ئیداریش بگرێتە دەست چونکە رۆحی بزوێنەرو بنەمای بژێوی ئابورییە ئەگەر ئەو سوپایە توانی سەرچاوەی ئابوری بگرێتە دەست و بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە مانای وایە یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی بە پاشکۆکردنی ئەو وڵاتەی مسۆگەر کردووە. بەهەمان شێوە لە پرۆسەی فەتحدا کە سوپای ئیسلام گەیشتۆتە کوردستان یەکێك لەو چەکە زۆر بەهێزانەی کە بەدەستەیەوە بووە بۆ ناچارکردنی کورد بۆ وەرگرتن و پەسەندکردنی پەیامەکەو قبوڵکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی چەکی ئابوری بووە. واتە دەوڵەتی ئیسلامی لە رێگای جۆرە فشارێکی ئابورییەوە کە ئەویش بریتی بووە لە جزیەو بە تایبەتی لەسەر ئەو کەسانە دانراوە کە نەبوون بە ئیسلام بەشێك لە ئابوری کوردستانی گواستۆتەوە بۆ ناوەندی دەسەڵاتی دەوڵەت کە سەرەتا لە دوورگەی عەرەبی و دواتریش لە عێراقی عەرەبدا بووە. واتە بەشێك لە ئابوری کوردستان گواستراوەتەوە بۆ (بیت المال). ئەمە سەرباری باج و خەراج کە سەرجەم خەڵکی گرتۆتەوە.بەهەرحاڵ ئەوەی ئاشکرایە کوردستان لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتابدا فەتح کرا. واتە لەو ساتەوە خەراج و جزیە لە کوردستان سەندراوەو دەوڵەتی ئیسلامی وەریگرتووە، دیارە لە پێش ئەو مێژووەشدا خەراج هەر وەرگیراوە بەتایبەتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ساسانیدا یەکێك لە سەرچاوەکانی داهاتی دەوڵەت خەراج بووە، کە هاوشێوەی ساسانیەکان دەوڵەتانی تری دەسەڵاتدار بەسەر کوردستاندا بەشێوەی جیاجیا خەراجیان لەم وڵاتە سەندووەو بەوەش بەشێك لە ئابوری کوردستانیان بەرەو لای خۆیان راکێشاوە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خەلیفە عومەری کوڕی خەتابدا کە کوردستان فەتح کرا ڕێژەی خەراج زۆر بەرزبۆتەوە بەتایبەتی هەر لەو سەروەختەدا عیراقی عەرەبی و میسریش فەتح کران و پانتاییەکی جوگرافیای زۆر کەوتە ژێر سایەی قەڵەمڕەوی دەوڵەتەوە کە دەبوو خەراج بدەن بۆ ز ەوییەکانیان، ئەمە سەرباری ئەوەی سیاسەتی ئیداری و ئابوری دەوڵەتی ئیسلامی سەرچاوەیەکی زۆ بەهێزی تری ئابوری دۆزییەوە ئەویش سەرچاوەی "جزیە" بوو کە سەرچاوەی بنەڕەتی جزیەش دیسان لای ساسانیەکانەوە هاتووە. قاسم حسین عەزیز دەڵێت: جزیە جۆرە پارەسەندنێك بوو کە ساسانیەکان دروستیان کردو لە هەموو خەڵکیان سەندووە جگە لە بنەماڵەی خۆیان(٢٢). دەوڵەتی ئیسلامیش هەمان سیاسەتی ئابوری لەبەرگرت، بەڵام جیاوازییەکە ئەوە بوو کە جزیە لە سەردەمی خەلیفە عومەردا لە هەموو ئەو کەسانە دەسەنرا کە لەسەر ئایینی خۆیان مانەوەو نەدەبوون بە ئیسلام بە تایبەتیش فەلەو جو و هەروەها زەردەشتی و هەموو خاوەن پەیامەکانی تریش.

دیارە ئەوە ئاشکرایە کە لە کوردستاندا خەڵکێکی زۆر بوون بە ئیسلام بەڵام لە بەرامبەر ئەوەدا کە لە سایەی ئیسلامدا ئازادی ژیانیان پێدرابوو، سەروماڵیان دەپارێزرا دەبوو جزیە بدەن، دیارە ئەو جزیەش بڕێکی زۆر بووەو سەرجەم گواستراوەتەوە بۆ دەرەوەی سنووری کوردستان واتە بۆ (بیت المال). هەر لە سەردەمی خەلیفە عومەردا بە گوتەی حسین مروە بڕی ئەو جزیەی کە لە ناموسوڵمانەکانی عێراق وەرگیراوە سەد ملیۆن درهەمی زیو بووە(٢٣) دیارە ئێمە بڕی ئەو جزیەمان لانیە کە لە ناموسوڵمانانی کوردستان وەرگیراوە ئەویش لەبەر ئەوەی مێژوونووسانی عەرەب و ئیسلام کە لەو مەسەلەیە دواون لە هیچ قۆناغێکدا دانیان بەوەدا نەناوە کە وڵاتێك هەیە ناوی کوردستانە هەتا سەرژمێری بۆ بکەن و زانیاری سەربەخۆی لە بارەوە تۆمار بکەن. بەرهەحاڵ هەر لەو کاتەوە بڕێکی زۆر لەداهاتی کوردستان لە ڕێگای

جزیەوەو برێکی زۆریش لە داهات لە ڕێگای خەراجەوە گواستراونەتەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت بۆ دوورگەی عەرەبی یان بۆ بەغداو سامڕاو دواتریش بۆ پایتەختی سەفەوی و عوسمانیەکان کە سەرجەم ئەم پرۆسەی گواستنەوانەش بریتی بوون لە گواستنەوەی ئابوری لە کوردستانەوە بۆ دەرەوەی کوردستان کە ئەوەش بۆتە کۆسپی بەردەم کۆبوونەوەی ئابوری لە کوردستانداو هەر بەوپێیەش بۆتە ڕێگر لە بەردەم دروستبوونی ناوەندی ئابوری و دروستبوونی بازاڕی هاوبەش لەم ولاتەدا.

هەر لە سەرەوەختی گەیشتنی سوپای ئیسلام بە کوردستان بە سەرۆکایەتی ئەبوعوبیدەی کوڕی جەراح ئەگەرچی مەبەستی کردن بە ئیسلامی کورد لە پلەی یەکەمدا بووە بەلام مەبەستی ئابوریش تەواوکەری مەبەستی یەکەم بووەو یەکێك بووە لە بزوێنەرەکانی پرۆسەی فەتح. دوای فەتحی شام ئەبوعوبیدە نامەیەکی بۆ خەلیفە عومەر نووسی کە ئایا بەرەو فەتح کردنی عێلات و خێلاتی کوردەکانی چیا بڕوات یان نا(٢٤). خەلیفە عومەر لەوەلامدا بۆی نووسی: داوا لە (کوردەکان) بکەن یان موسوڵمان بن و پەیڕەوی ئایینی ئیسلام بکەن یان سەرانە بدەن ئەگەر ئەم مەرجانەیان پەسەند نەکرد ئەنجا جاڕی شەڕیان لەگەڵ بدەن(٢٥).

هەر لە بارەی ئامانجی ئابوری پرۆسەی فەتحەوە دکتۆر عەبدولعەزیز ئەلدوری دەڵێت: فەتح ڕێگایەك بوو بۆ عەرەب هەتا ژیانێکی باشتری لێوە بەدەست بهێنێت(٢٦). هەندێ بۆچوونی تریش هەن کە پێیان وایە عەرەب لە ڕێگای پرۆسەی فەتحەوە لە نیمچە دوورەگەی عەرەب چونە دەرەوەو لە برسێتی ڕزگاریان بوو. ئەم وتانەش ئەوە دەسەلمێنن کە عەرەب و دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی لە ڕێگای پرۆسەی فەتحەوە بەشێکی زۆر لە ئابوری ولاتانی بەر فەتح کەوتوویان بۆ خۆیان ڕاکێشاوەو بردووەو گواستویانەتەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت کە ئەویش بە

گوێرەی کورد هەمیشە لە دەرەوەی سنووری جوگرافیای وڵاتەکەی ئەمدا بووە، واتە بەشێك لە ئابوری کوردستان گواستراوەتەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت لە دەرەوەی کوردستان ئەمەش هۆیەکی سەرەکی بووە بۆ ئەوەی ئابوری لە کوردستاندا کەڵەکە نەبێت یان بە واتەیەکی تر لە دەرەوە کێش بکرێت، ئەوەش پێچەوانەی کۆبوونەوەی ئابوری و دروستبوونی ناوەندی ئابوریە لە کوردستاندا.

جگە لە گواستنەوەی بەشێکی ئابوری کوردستان بۆ خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامی لە رێگای جزیەو باج و خەراج و زەکاتەوە. هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا لەو شوێنانەی نیشتەجێ بوونی تێدا هەبوو مزگەوتەکان دروستکران چەندین پارچە زەوی کشتوکاڵی و کانیو کارێزو سەرچاوەو باخ و لەوەڕگا کران بە وەقفی مزگەوتەکان کە داهاتی ئەمانەش بە شێوەیەکی گشتی دەگواسترایەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامی واتە لە کوردستان دوور دەخرانەوە، ئەم حاڵەتەش بۆ ماوەی دوورو درێژ بەردەوام بووە. جێگای خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە یەکێك لە هۆیەکانی بزوتنەوە نەیارەکانی دەوڵەتی ئیسلامی کە زۆربەی ئەو بزوتنەوانەش لە سەردەمی عەباسیەکاندا بووە هۆکاری ئابوری بووە چونکە دەوڵەت بە جۆرێك فشاری باج و خەراج و جزیەی خستۆتە سەر خەڵك کە زۆربەی خەڵك پێیان هەڵنەسوڕاوە، ئەنجامی ئەوەش راپەڕینی لێکەوتۆتەو، یەکێك لەو بزوتنەوانەی کە بەشێکی لەسەر خاکی کورد بووەو کورد تیایدا بەشدار بووە بزوتنەوەی بابەکی‌یە(٢٧) لەوانەشی تیایدا بەشداربون عیسمەتی کوردی و میری چەند خێڵێکی کوردن لە ئازربایجان(٢٨) کە رێژەی بەرزی باج و خەراج وایلیکردون رابپەڕن، واتە ئەو راپەڕینانە بە مەبەستی نەدانی باج و خەراج و جزیە بوون، لە ئاستێکی تردا دەوتوانین بڵێین ئەو راپەڕینانە بەو مەبەستە ئەنجام دراون کە ئابوری ئەو ناوچانە کە ئێمە لێرەدا مەبەستمان وڵاتی کوردە نەگواسترێتەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامی

بەڵکو لە سنووری وڵاتی خۆیاندا بمێنێتەوە، بەڵام دەوڵەتی ئیسلام دەست بەرداری ئەو داهاتە نەبووەو هەوڵیداوە بەهەر جۆرێك بێت بگوازرێتەوە ناوەندی دەسەڵاتی خۆی کە ئەوەش بنەمای کۆلۆنیالیکردنی ئابوری هەیە، ئەگەرچی بۆ ئەو سەردەمە زاراوەی کۆلۆنیالیکردن بەو شێوەیە دەرنەکەوتووە.

لە دوای روخاندنی دەوڵەتی عەباسی و گواستنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی بۆ دەستی تورکە عوسمانیەکان و پاشانیش بالادەستبوونی دەوڵەتی سەفەوی بۆ بەشێك لە دنیای ئیسلام ئەمجارەیان ئابوری کوردی لە جیاتی ئەوەی بەرەو بەغدا کێش بکرێت بە دوو ئاراستە جیاواز کێش دەکرا. بەشێکی بە ئاراستەی ئەستەمبوڵ واتە پایتەختی ئیمپراتۆری عوسمانی ئیسلامی و بەشەکەی تریشی بە ئارستەی پایتەختی ئیمپراتۆری سەفەوی لە ئێران. دیارە سەرباری ناکۆکی نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆرە هێشتا لەسەر دابەشکردنی کوردستان لە نێوان خۆیاندا کۆك بوون و هەر لەم قۆناغەدا جگە لە دەسەڵاتی لاوازی ناوچەیی دەسەڵاتێکی ئیداری و بەهێز لە کوردستاندا دروست نەبوو هەتا بتوانێت ئابوری کوردستان بە ئاراستەی خۆی کێش بکات و لە سنوری کوردستاندا ناوەندی ئابوری دروست ببێت.

سەرباری بوونی چەند میرنشینێکی لاواز لە کوردستاندا دەسەڵاتی ئابوری و بڕیاری ئابوری هەر لە دەستی ئەو دوو ئمپراتۆرەدا بووەو هەرچۆن ناوەندی ئابوری لە کوردستان دروست نەبوە بە هەمان شێوە ناوەندی بڕیاری ئابوریش دروست نەبووە. بۆ نموونە بابی عالی بە ئارەزووی خۆی بۆ هەرکەس مەبەستی بووبێت زەوی کوردستانی تاپۆ کردووەو بە ئارەزووی خۆی زەوی بەخشویە یان کردویەتی بە مڵکی دەوڵەت و بە وەقفی مزگەوت و بنەماڵە دیارەکان کە ئەمانەش ناڕاستەوخۆ چوونەتەوە خەزێنەی دەوڵەت و بە شێوەیەکی گشتی لە کوردستان چوونەتە دەرەوە، سەفەوییەکانیش سیاسەتێکی هاوشێوەی

عوسمانیەکانیان هەبووەو بەهەر جۆرێ بۆیان لوا بێت هەوڵیان داوە ئابوری کوردستانی ژێر سایەی قەڵەمڕەوی خۆیان بگوازنەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەتی خۆیان کە ئەویش لە دەرەوەی کوردستاندا بووە ئەوەش وایکردووە کە هیچ ناوەندێکی ئابوری لە کوردستاندا دروست نەبێت.

بێگومان داگیرکەرە نوێیەکانی کوردستانیش وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد بە هەموو شێوەیەك هەوڵیانداوە ئابوری کوردستان چ ئابوری کستوکاڵی و ئاژەڵداری چ مادە خاوەکان و تەنانەت (ئاو)یش لە کوردستانەوە بگوازنەوە بۆ ژێر سایەی دەسەڵاتی راستەوخۆیان و بۆ نێو جوگرافیای نەتەوەیی خۆیان بەو مەبەستەی کە رێگای دروستبوونی ناوەندی ئابوری و بازاڕی هاوبەش لە کوردستاندا نەدەن چونکە لەوە بە ئاگان کە دروستبوونی ناوەندی ئابوریو بازاڕی ناوخۆو بازاڕی هاوبەش لە کوردستاندا دەبێتە هێزێك کە چەقی راکێشان و کۆکردنەوەو یەکخستنی کورد دروست دەکات و بێگومان ئاکامی ئەو کۆبوونەوەو یەکگرتن و یەکبوونەش هێزێکی ئەوتۆی لێدروست دەبێت کە بتوانێت زەمینەوەی دروستبوونی بە بکەربوونی کورد بڕەخسێنێ.

# ئەنجام

لە ئەنجامی ئـەم لێکۆڵینـەوەدا دەگەینـە ئـەو دەرئەنجامـەی کـە تـاکو ئێستا ئابوری لە کوردستاندا بەو ئەندازەیە کۆنەبۆتەوە کە ببێتە ماکی پێکهێنانی ژێرخانێکی ئەوتۆ کە هـەم دەوری بزوێنەری مێژوو ببینێت لەم کۆمەڵگایەداو هەم ببێتە بنەمای پێکهێنانی سەرخانێکی کۆمەڵایەتی پێگەیشـتوو هـەروەها دەوری خـۆی ببینێـت لـە رێکخسـتنی بنـەماو زەمینـەی پێکهاتنی توێژو چینە کۆمەڵایەتیەکانداو قۆناغەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی و پەرەسـەندنی کۆمەڵایـەتی بـە شـێوەیەکی تـەواو و پێگەیشتوانە خاڵرێژی بکات و لە ئاستێکی ئەوتۆدا بێت کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیـەکانی بەرهـەم هێنـان بـە تـەواوی رێـك بخـات و سیسـتەمە کۆمەڵایەتیەکانی بەرێوەبردن بەهـەموو خاسـیەتەکانیانەوە بنیـاد بنێـت. بێگومـان نـاوەندی ئـابوری دەبـێ وەکـو نـاوەند ببێتـە بنـەمای بەرهـەم هێنـانی جوڵـەو رەوتـی سروشـتی پەرەسـەندنی کۆمەڵایـەتی و لـەو ئاقارەشـدا ئـابوری وەکـو فاکتـەرێك دەبێتـە بزوێنـەری مێـژوو چ لـە گەیاندنی کۆمەڵدا بە ئاستی پێکهێنانی دەوڵەت چ لـە بزواندنـی کۆمـەڵدا بۆ بنیادنـانی شارسـتانی و بەرهـەم هێنـانی شارستانیدا، دیـارە هـەر کۆنەبوونـەوەی ئـابوری لـە کوردسـتانداو دروسـت نـەبوونی نـاوەندی ئابوری هۆی سەرەکی پێکنەهاتنی بازاڕی ناوخۆ یان بازاڕی هاوبەشـەو بـەو پێیـەش ئـابوری نـەیتوانیووە ببێتـە بنـەمای سـەرەکی ململانـێی کۆمەڵایـەتی لـە کۆمـەڵگای کوردیـدا یـان بـە واتایـەکی تـر ئـابوری

نەگەیەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان کۆنترۆڵی هەموو ململانێ و ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگای خێڵایەتی کوردی بکات و لەنێو ململانێیەکی بەربڵاوتردا بیان توێنێتەوە کە ئەویش ململانێی چینایەتیە کە لەو ململانێیەشدا چینی باڵادەست دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو کۆمەڵدا بکات و دەسەڵاتی چینایەتی خۆی دروست بکات کە ئاسایی ئەو دەسەڵاتەش لە شێوەی دامەزراوی دەوڵەتدا دەبێت.

دیارە ئەو هۆکارانەشمان خستەڕوو کە دەوریان بینیووە لە لە باربردنی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا. کە ئەوانیش بریتی بوون لە سروشتی بەرهەم هێنانی لاوازو ئیکتیفای زاتی و لەبەر رۆیشتی ئابوری و رۆڵی داگیرکردنی کوردستان لە دێرزەمانەوە تاکو ئێستا.. کە سەرجەم ئەم هۆکارانە بنەمای پێکهاتنی ناوەندی ئابوری کوردستانیان لەبار بردووەو بەوپێیەش رێگایان نەداوە کە زەمینەی پێکهاتنی دەوڵەتی کوردی بڕەخسێت، بە واتایەکی تر دروست نەبوونی ناوەندی ئابوری بۆتە هۆی ئەوەی کە فاکتەری ئابوری نەتوانێت ببێتە بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیداو لە ئاکامدا کورد بگەیەنێتە قۆناغی دروستکردنی دەوڵەت. هەر هیچ نەنبێت لە سەروەختی دەرکەوتنی چینی بۆرژواو سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتیدا. بە مانایەکی تر دەتوانین بڵێین لە ئەنجامی کۆنەبوونەوەی ئابوری لە کوردستانداو دروست نەبوونی ناوەندی ئابوری کوردی هەست و هوشیاری نەتەوەیی کوردی بە سروشتی نەخەملاوە چونکە چینی بۆرژوا کە هەڵگری پەیامی نەتەوایەتیە نە بە سروشتیو تەواوی پێکهاتووە، نە توانیوویەتی هەڵگری خاسێت و سیفاتە چینایەتیەکانی خۆی بێت کە ئەرکە نەتەوەییەکان لە راستیدا لە ئەستۆی ئەودایە.

لێرەوە دەتوانین دروست نەبوونی ناوەندی ئابوری لە کوردستاندا بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی بەرەدم دروست نەبوونی دەوڵەتی

کوردی دابنێن و ناسروشتی ناسیونالیزمی کوردیش کە تاکو ئێستا ناتوانێت هەڵگری بەرنامەی دەوڵەت و دروست کردنی دەوڵەتی کوردی بێت دەگەڕێتەوە بۆ باری شێواو ناسروشتی پێکهاتنی ئەو ناسیونالیزمە لەژێر کاریگەری پەرەسەندنی ناسروشتی کۆمەڵگای کوردیدا کە ئەویش دەرئەنجامی لاوازی و حاڵەتی ناسروشتی بەرهەم هێنان و کۆنەبوونەوەی ئابوری و دروست نەبوونی ناوەندی ئابوری کوردیە لەگەڵ نەیتوانی بوونی ئابوری بە فاکتەری بزوێنەری مێژوو لەم کۆمەڵگایەدا.

سەرچاوەکان:

١-الدكتور محمد عابد الجابري- العصبية و الدوله- دار الشؤون الثقافة العامة- بغداد- ص٢٢٥.

٢-نفس المصدر- ص٢٥٣.

٣-الدكتور سمير امين- التطور اللامتكافيء- ترجمه: برهان غليون- الطبعة الثانيه- ص٢٥.

٤-ابن خلدون- المقدمه- دار الجيل- ص٤٦.

٥-شەرەفخانی بەدلیسی - شەرەفنامە- وەرگێڕی هەژار- ل ٣٧.

٦-هەمان سەرچاوە- ل ٩٨.

٧-سي. جي. ادمونز- كورد و ترك و عرب- ترجمه جرجيس فتح الله الطبعة الثانيه، اربيل ١٩٩٩- ص٢٣.

٨-شەرەفخانی بەدلیسی- شەرەفنامە- ل ٣٨.

٩-آ. شاميلوف- حول مساله الاقطاع بين الكرد- ترجمه الدكتور كمال مظهر احمد. الطبعة الثانية- بغداد- ١٩٨٤- ص ٤٤.

١٠-نفس المصدر، ص ٤٤.

١١-الدكتور محمد عابد الجابري- العصبية و الدولة- ص٢٢٠.

١٢-عەتا قەرەداغی - خێڵایەتی کوردی و ئاستەنگەکانی بەردەم دروستبوونی فیدراسیۆن، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ- ژمارە (١٥) ساڵی ١٩٩٩.

١٣-الدكتور سمير امين- التطور اللامتكافیء- ص١٣.

١٤-نفس المصدر- ص١٣.

15-Edith and E.F. Penrose- Iraq- International Relations and National Development- London- 1978. P.P. 32-33.

١٦-مەسعود محەمەد، حاجی قادری کۆیی.

17-David Adamson . The Kurdish War- London- 1964. P. 15.

١٨-مینۆرسکی -کورد- وەرگێڕانی: حەمە سەعید حەمە کەریم-بەغدا- ١٩٨٤- ل ٣٣.

19-Martin Van Bruinessen- Agha, Shaikh and State, Zedboiks- 1992. P. 11.

٢٠-لوسيان رامبو (توما بوا) -الكرد و الحق- ترجمة: عزيز عبد الاحد نباتي- اربيل ١٩٩٨- ص٢٥.

٢١-ن. آ. خالفين- الصراع على كردستان- ترجمة: الدكتور احمد عثمان ابوبكر بغداد- ١٩٦٣- ص١٢.

٢٢-الدكتور قاسم حسين عزيز- البابكية- دار الفارابي- بيروت- ص٧٩.

٢٣-حسين مروة- النزعات المادية في الاسلام- الجزء الاول- ص ٤١٨.

٢٤-ولاتگیری رەشە خەڵکی عیراق- وەرگێڕانی مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی- سلێمانی ١٩٩٧- ل ١٦.

٢٥-هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦.

٢٦-الدكتور عبدالعزيز الدوري- الجذور التاريخية للقومية العربية- بيروت دار العلمية للملايين ١٩٦٠، ص ١٦.

٢٧-عەتا قەرەداغی، بزوتنەوەی بابەکی و پەیوەندی بە کوردەوە، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (١)ی هاوینی ١٩٩٧.

٢٨-احمد بن ابی یعقوب بن جعفر، تاریخ الیعقوبی، الجزء الثالث، ص٢٠٧.